کەریم دەشتی

# کازێوەی سپیی شیعر

منتديات اقرأ الثقافية www.iqra.ahlamontada.com

## کۆبەرهەم

2019 تا 2020



بەرگی سێیەم

چاپی سێیەم

www.iqra.ahlamontada.com

* ناوی کتێب :کازیوەی سپیی شیعر- کۆبەرهەم - شیعر2019 - 2020
* ناوی شاعیر : کەریم دەشتی - 1955- - هەولێر
* ژمارەی سپاردن: 944 ساڵی 2012 هەولێر
* چاپی یەکەم - دەزگای ئاراس 2004 هەولێر
* چاپی دووەم - مەڵبەندی گشتی یەکیەتی نووسەرانی کورد 2012 هەولێر
* ئیمێل karimdashti59@yahoo.com
* ژمارەی مۆبایل 07504512785
* وێنە شاعیر : هێڵکاری هونەرمەند محمد اسماعیل
* ئەو شیعرانەی نەخراونەتە ناو ئەم کۆبەرهەمە، پەیوەندی بە ئاستی شیعرەکانەوە هەیەو بەس.
* مافی چاپ و بڵاوکردنەوەو کۆپی و وەرگێرانی یا دووبارە بڵاوکردنەوەی بۆ هەموو کەسێکە، تەنها مەرجی کەدەبێ رەچاو بکرێت ئەوەیە، نابێ دەسکاری بکرێت، دەنا دەخرێتە ژێر باری یاساییەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

## یادەوەرییەكانی نەی نەوا

هەمیشە خەیاڵێك
ئەمباتەوە سەر زێیە دوورەكانی بابل
ئەو زێیانەی لەوێ
بەدەم سەمای زەریە خەمگینەكانەوە
هاوارم ئەكرد كە بۆ ئەبەد با هەڵنەكات
نەبا ئەو دەنگانەم لێ بڕفێنێ
كە هەمیشە وەك هەڵمی سپێدەی گیا
لە كەلێسا دوورەكانەوە بانگیان ئەكردم
ئەو دەمانەش كە بەسەر باڵی شەوقەوە ئەگەیشتم
لەتاو سەمای جوانی و شاپەری ئاسكان  ئەمردم
یا ئەو ناڵەیەی
لەدوورترین كوختی قامیشەڵانەوە ئەهات



www.iqra.ahlamontada.com

که ناڵەی ئەو عاشقانە بوو
لەبەر تای ئەشق کەوتبوون
نەی نەوا ئەی ئۆرۆکی ماندووتر
لەو کچە قەفقاسییانەی
لە بەیانەوە تا ئێوارە شلکەی ڕانیان
ئەبەخشن بەو چاوە زیتانەی
هەوەس لە هۆش خۆی بردبوون
وەك ئەوەی لە چاوەڕوانی قوڵینگان
هەزار ساڵە نەخەوتبن



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەڵقەی پساو

ئەوسا کە بایێ لەو بایانەی
من هەمیشە لە گەڵیا مەست ئەبووم
ئەو بایانەی هەڵیان ئەکرد
خێرا خێرا دەستی تۆم ئەگرت
ئەچووینەوە سەر ئەو گردانەی
لەوێوە منارە بریقەدارەکانمان ئەدیت
تا ئەو کاتەی مانگ بەدزییەوە
لە پشت باڵی باشوکەکانەوە هەڵئەهات ئەماینەوە
کزەیێك وەك پۆلیە گڕێ
بەسەر گەڵاکانی جەستەم ڕائەبوورێ
هەموو برینەکانم ئەکولێنێتەوە
چەند دووری، ماڵەکەی تۆ لە لای ماڵی خوایەو
دەرگاکانت بە پرچی فریشتەکان ئەڵقە دراون
ئەمەوێ بگەم بەتۆ
ئەبێ بگەم بە خودا
ئەفسوس بۆ بووی بە خودا؟ بۆ ؟



www.iqra.ahlamontada.com

## ڕۆژەکانم

ڕۆژەکان هی من بوون
تیایانا جوانترین پاپۆڕی شیعرم
ئەخستە بەر شەپۆلی دەریا
شەمووانی ئەچوومە باخچیلەی ماڵەوە
لە قوڕی سپی خەیاڵم
شەرابی سوورم دروست ئەکرد
یەکشەمووان بەسەر گردەکەی مەحەتە
گوێم لە دەنگی قیتاری نۆ فارگۆن ئەگرت
دووشەمووان لە بەرەبەیانەوە
قاوەم ئەخستە سەر ئاگرو
تا ئیوارە کتێبخانەکەم پاك ئەکردەوە
کتێب هەبوو دوای چەندین ساڵ
سەر لە نوێ بە یەکتر شاد ئەبووینەوە
هی واش هەبوو یەکەم جار بوو کە ئەمبینی
بە ساردی سڵاوێکی لێ ئەکردم
ئەمزانی دڵی شکاوە و چەندین ساڵە
بێ ڕەحمانە لە زیندانی ئەو ڕەفانە بەندم کردوون
کۆنە پەڕی زۆرم لە نێو لاپەڕەی کتێبان ئەدۆزییەوە
گەنجینەی حیکمەتی وجوود بوون



www.iqra.ahlamontada.com

هێندێکیان نامە بوون فرمێسکیان بەسەردا ڕژابوو
هێندێکیا شیعریان بەسەرا نووسرابوو
هەموو ڕۆژەکان هی من بوون
سێ شەمووان با دەستی ئەگرتم و
ئەیبردمە دوورترین دارستان
ماڵی یەکەمین کوکوختی بوو
چوار شەمووان سەرێکی گۆڕستانم ئەداو
هاوڕێکانم هەموویان لەوێدا لەسەر پشت ڕاکشابوون
چییان لێ هات؟؟ کەس قسەی کەسی نەئەبڕی و
هەموویان بە هێمنی
لە ژێر خۆڵەوە سەیری ئاسمانیان ئەکرد
چییان لێ هات ؟ بۆ ڕۆیشتن
ئێستاش هەروا چاوەڕوانم بێنەوە لام
پێنجشەممان پڕ لە ئێوارەی نارنجی بوون
ئەو ڕەنگانە منیان ئەبردەوە بۆلای بارەکان
بۆ لای ئەو مەلە مل باریکانەی
لەسەر مێزەکە هەڵئەنیشتن
ئێستا ڕۆژەکان هی من نین
شەممەکان باخێکی سیس و جۆگەلەی وشك
دنیا ژەنگی هەڵێناوە
یەکشەممان ریتمێکی ساردو دەنگی ناسازی لورەیەك



www.iqra.ahlamontada.com

لە دوورەوە گوێمان ئەسمێ
دووشەممان هەر ئەڵێی مرۆڤە
لە ئاوێنەی شکاو خۆی ئەبینێ
ڕۆحی هەلا هەلا بووە
سێ شەممان کز کز ئەسووتێن ئێستا نا ئێستا
ئەکوژێنەوەو ئەچینەوە بۆ تاریکی
چوار شەممان لە سینەمایێ ئەچێ فیلمی لێ سووتابێ
شاشەو بەختی لێ شکابێ
پێنج شەموانیش بەیەکەوە دا ئەنیشین
قسەی گەورە فڕێ ئەدەین
هێندێ ئەبینە فەیلەسوف، هێندێ قەرەج ،
هێندێ شەکسپیر، هێندێ باشترین تەباخ
ئاخ ڕۆژەکان تامیان نەماوە



www.iqra.ahlamontada.com

## گەمەکانی ژیان

وەك جگەرەیەکی داگیرساوم
ژیان قوم قوم ئەمکێشێ
تادێ باڵام هەڵئەپاچێ و
جەستەم ئەداتە دەست دوکەڵ
چەند بێهوودەیە ئەم ژیانە
هەندێ جار بۆم ئەگری و هەندێ جاریش پێئەکەنێ
دڵۆپ دڵۆپ هەڵم ئەمژێ
گەز گەز گۆشتم لێ ئەسەنێ
سەیرکە شاعیر لە کوێ؟ ژیان لە کوێ؟
گەوهەری من لەم ژیانە
چەند بوتڵێ لە خەمی قووڵ و
چەند سنووقێ لە خەیاڵ و
چەند ڕەفەیێ لە کتێب و چەند چاویلکەیێ
بۆ بینین و چەند ئاوازێ بو گریان و
چەپکێ لە ڕێحانەی هزرو
گۆلمێ لە فرمێسکی مناڵیی و
چەند قووتوێ لە هەناسەی ساردە
ژیانیشم بریتیە لە چەند شتێکی سادە
کەوتنی هەتاهەتاییم لە سێبەری خەمگینی قەڵا



www.iqra.ahlamontada.com

وەستان لە کەنار ڕووباران

یا دروست کردنی ئایدیا

بە بەردوداری وردە خەیاڵ

خواردنەوەی چەند قومێ لە ژەهری فۆدکاو

شکاندنی چەند کەڵبە قەندێ لە گەڵ برادەران

چڕینی چەند گۆرانییەکی کۆن

کە وەك حەشیشە ئەمانخاتە باخی وەهم

ئیدی ژیان ئاوایە لە کابرایەکی حەشاش ئەچێ

هەمووومان دائەگیرسێنێ

پاشان دەستێ ئەنێ بە گیرفانی ڕۆحمان و

هەموو شتێکمان لێ ئەسەنێ

هەندێ جار بە کیسە قاقامان بۆ دێنێ

بە قەرتاڵ گریانمان پێ ئەبەخشێ

بای ناو دارستانەکانمان بۆ ڕائەخاو

لە ژێرەوەش وردە وردە

بەڕمان لە ژێر پێ ڕائەکێشێ

پشتی سەرمان ئەدا بە ئەرزو

دڵۆپێ خوێن لە ناو جەستەمان ناهێڵێ

چوزانم ژیان زۆر سەیرە هیچ سوحبەتێك نازانێ



www.iqra.ahlamontada.com

ڕۆژنامە ناخوێنێتەوەو شیعر نانووسێ
جار جار بۆ هەوەس دێتە سەرمێزەکانی ئێمەوە
هێندێکمان ئەبا بە دیاری
ئەماندداتەوە دەست باری تەعالاو ئەڵێ
ها ئەوە دەستکردە جوانەکانتن
شکاون چاکیان کەرەوە
یا هی تری لێ دروست بکە.
ئەوە ژیانە ئیدی جا ئەڵێی چی؟



www.iqra.ahlamontada.com

## بێ ئاوڕ

1

له سفرەوه دەست پێئەکەم
له یەکەم خورپه و یەکەم داگیرسان
له یەکەم باران له یەکەم زریان
له یەکەم ئەوین له یەکەم تاسان
له یەکەم بزەو له یەکەم گریان
چی ڕابردووی درەوشاوەو خامۆش هەیه
له کتێبێ داینەڕێژم
تا له شورەی پۆڵابەندی یادەوەریدا بینێژم

2

له سفرەوه دەست پێئەکەم
چی ئەلفابای نووسین هەیه
هەموویان ڕەش ئەکەمەوه
چی پێکەنین و بزەیه
به قەدەری هەڵئەواسم



www.iqra.ahlamontada.com

## 3

له سفره‌وه ده‌ست پێئه‌که‌م

په‌یمان له‌گه‌ڵ گوێ ئه‌به‌ستم

هه‌تا گوڕو خوێنی مابێ

ده‌رگای له سه‌دای بێهوده کلیلبدا

قسه‌یێ نه‌بیستێ که ژه‌هری زمانی تیا بێ

به چاوه‌کانی خۆم ئه‌ڵێم

تیشکی خۆیان بۆ قوڵایی بهاوێژن

له پێناوی تاقه ڕه‌نگێکی ئه‌به‌دیدا

چی ڕه‌نگ هه‌یه هه‌ڵیانڕێژن

ڕێکه‌وتنێ له‌گه‌ڵ زمانم مۆر ئه‌که‌م

قسه‌یێ فڕێ نه‌داتن

لێوڕێژی به‌ها نه‌بێتن

شیعرێ نه‌خاته سه‌ر په‌ڕه‌ی

له گیادا سه‌وز نه‌بێ

نامه‌یێ بۆ لووت ئه‌نووسم

هه‌موو بۆنه‌کان وه‌لانێ

ته‌نها بۆنی یه‌که‌م لاسکی ئه‌وین نه‌بێ



www.iqra.ahlamontada.com

4

لە سفرەوە دەست پێئەکەم

پەنجەکانم تەرخان ئەکەم بۆ جوانڕێژێ

دڵم ئەکەم بە خەزنەی با

دابخورپێ بەو دێرانەی

کە دائەڕژێن لە دوای مەستی

ڕۆحم ئەکەم بە میحرابێ

بۆ کۆڕەوی بەی پەرستی

5

لە سفرەوە دەست پێئەکەم

وەك شاعیرێ تازە یەکەم کتێبی ئاشقانەی کڕیبێ

وەك منداڵێ یەکەم جار بێ بە دوای پەپوولە ڕابکا

یەك دارستانی بڕیبێ

وەك ئەوەی یەکەمین جارە کەوا من ئاسمانم دیبێ

یەکەم جار بێ بچمە نێو ماڵی درەخت و

سەرسام ببم بەوەی ئاخۆ

ئەبێ گەڵای وەریو چی بێ ؟

وەك ئەوەی گوێم لە هێچ شتێکا نەبووبێ

یان زمانم تازە پژا بێ

چاویشم هیچی نەدیبێ

6



www.iqra.ahlamontada.com

له سفرەوە دەست پێئەکەم
بۆ خوێندنەوەی جوانی نەبێ هەرگیز چاوم ناکەمەوە
بۆ بیستنی ئەوین نەبێ وەڵامی گوێ نادەمەوە
جگە لە چوون بۆ ناو ماڵی جاویدانی
هیچ ڕێگایێ ناگرمەبەر
بۆ پێشوازی ئەوین نەبێ
هیچ تاجێکی دیکەی شیعر ناخەمە سەر



www.iqra.ahlamontada.com

## سپییەکان، سپی سپی

1

فەزا سپی و دڵیشم سپی

فەزا تەنها و دڵیشم تەنها

ئاخ من و فەزا چیمان کردووە

ئاوا سەدای نەی

دەنگی نهێنی و ئاشکرای ناڵە

لە ناخی ئێمەی گەردوون مردووە

2

دوور دوور ئەڕوانم فەزا تا بڵێی بێدەنگ و چۆڵە

هەست ئەکەم دڵم وەك ئەو فەزایە

تەنها بێدەنگی و چۆڵی تیایە

دڵێك وەك فەزا چۆڵ و بێدەنگ بێ

ئەبێ ئەو دڵە چەند بە تۆ بەند بێ

بێ تۆیی ئەبێ چی بۆ هێنابێ

جگە لە کڵپەی ئاوری تاسە

ئەبێ چۆن تارو ماری کردبێ

3

دەنگێ لە فەزا وەك نوور هەڵئەچێ

بانگی تەنهایی و بێدەنگی کەونە



www.iqra.ahlamontada.com

دەنگێ لە دڵم وەك گڕ هەڵئەچێ
دەنگی سووتان و ئاورو خەونە

4

فەزا وەك دڵم پڕ ئاوێنەیەو ئەتروسكێنێ
دڵم وەك فەزا پڕە لە هەورو ئەبروسكێنێ
من بە تروسكە فەزا ئەناسم
فەزا بە بروسكە دڵم ئەناسێ

5

ئێمە دوو جەستەی ناو بەفری سڕین
بە خوێنی غەیب و گەوهەری شمشێر
لە وێنەی خوداو مەجازی شیعر خزمی یەكترین
لەشكری فەزا باران و هەورە
لەشكری دڵم ئاورو ئەوین

6

فەزا پەست ئەبێ باران دائەكا
ئەو وێنەی وەهمی ئەوینی نییە
تا وەكو دڵم كتێب تەی بكا
من چەند بچووكم لەناو سپییاتی  فەزای بەرینا
فەزا سەت ئەوەن لە ناو دڵی من



www.iqra.ahlamontada.com

7

فەزا بەو بەرگی سپیپاتی خۆی

تەواوی دونیای کفن کردووە

دڵم بە گڕی ئاگراوی خۆی

تەواوی فەزای گەرم کردووە

8

ئای فەزا لە چاو دڵی من چەند بچکۆڵەیە

من چەند بە تەنهام لە نێو گەورەیی ئەم فەزایەدا

وەك ئەستێرەیێ نە مەداری خۆی ئەدۆزێتەوە

نە ئەتوانێتن بێتەوە زەوی

نە فەزا شیری هەردوو مەمکی خۆی پێ ئەبەخشێتن

نە ناوی هەیە لە لەوحی خودا

ئەوین بە چەشنێ بە پەرژینی گڕ بەندی کردووە

بۆیە تا هەتا لە بۆشایی کەون ئەسوڕێتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

9

له نێو پانتایی ئەم فەزایەدا
من تەنها دڵم بۆ تۆ لێئەدا
کە تۆ تەنهابیت لە نێو پانتایی ئەم فەزایەدا
ئاخۆ ئەبێ من چەندە تەنهابم
کە دوو جۆر تەنها ئابلۆقەی داوم
یەکیان ئەوینت ئەویتر فەزا



www.iqra.ahlamontada.com

## ڕەشبوونەوە

1

هەموو شتێ  لە ناکاودا گۆڕا

مانگ وتی ئەوە من نەبووم

کەی من شەوق و تریفەم داوە بە ئێوە

ڕووبار وتی ڕۆژێ من شەپۆلم نەبووە

زەوی وتی من نەبوویمە کۆیلەی باران

3

هەموو شتێ لە ناکاودا گریا

من بۆ ئەوینی جارانم

ئەو بۆ ئەوینی جارانی

مانگ بۆ ئاسمان

ڕووبار بۆ گرمەی شەپۆلی

زەوی بۆ دلۆپەی بارانی

منیش بۆ خۆم

4

هەموو شتێ لە ناکاودا ونبوو

مانگ ئاوابوو

ڕووبار وەك بروسکە تێپەڕی

زەوی  خۆی لە شەختەدا شاردەوە

خودا لە هەور دابەزی منی بۆ عەدەم ناردەوە



www.iqra.ahlamontada.com

5

هەموو شتێ لە ناکاوتووڕە بوو

مانگ لەبەر قژی تریفەی

ڕووبار لە شریخەی شەپۆلی بێکۆتایی

زەوی لە هاواری مرۆڤ

منیش لە ناو گۆرانی چرینی تەنهایی

6

هەموو شتێ لە ناکاودا شکا

کە شوشەی مانگ کەوتە بەر لێزمەی باو بۆران

کە ئاو لە ڕووبار تووڕە بوو

زەوی لە بومەلەرزەدا مرد

منیش کە ئەوین لە ناو دڵمدا چکی کرد

7

هەموو شتێ لە ناکاو بوو بە ئەبەنووس ڕەشداگەڕا

مانگ لە پرسەی سپی بوونی کەزی تریفەی کچەکانی

ڕووبار لەتاو کۆچی بەردەوامی شەپۆلانی

زەوی لە سۆنگەی وەرینی قژی هەموو درەختەکانی

منیش لە تای ئەوین و کۆچی هەمیشەو بێئامانی



www.iqra.ahlamontada.com

هەموو شتێ لە ناکاودا پیر بوو
مانگ لەناو هەوری ڕەش
ڕووبار لە نسێی نساران
زەوی  لە ژێر پێی ئینسان
منیش لەگەڕان بە دوای تۆ

9

هەموو شتێ لە ناکاودا سیس بوو
مانگ کە با هات تۆقەی لە قژی تریفەی دا
ڕووبار کە  مافوری شەختە دایپۆشی
زەوی  کە پاییز بوو بە میوانی
منیش کە تۆ دەرگای ئەوینت کلیلدا



www.iqra.ahlamontada.com

## کۆترەکانی سایلۆ

لە کوێوە هاتوون خودایە
مەرجانن لەنزیك ماڵی تۆ
کە ئەفڕن وەك بەفرن
لە ئاسمانە هەڵئەڕژێن
ئێواران کەباڵیان پڕ ئەبێ
بە سەر تاقە بەرزەکانەوە هەڵئەکورمێن
کە تابان زیوی خۆی ئەبەخشێ بە ڕۆحیان
هەر ئەڵێی دەنکە هێشووی ترێن
لەوێ لە لای ڕێستهاوسی سیحرو جوانی
یادە بەردینەکەی ئینگلیز
کاروانی عاشقان ئەهاتن
خۆیان و جانتایێ کتێب
خۆیان و باوەشێ جریوەی چیا
بەدیار پەنجەرە و باخاتی ناو مەحەتە
شەڵال ئەبوون لە چاو چاوێنی و گۆرانی



www.iqra.ahlamontada.com

ئاخ خودایە

بۆ جارێکی تر نەچوومەوە سێبەرەکەی سایلۆ

غەرقی جوانی جاران بم و  مەست بم وەکات

جارێکی تر لە غاباتەکەی کوراندا

کتێبێ بگرمە دەست و داڵغەی ئایندە لێبدەم

ئەو ئایندەی تاوەکو ئێستاش هەر نەهات



www.iqra.ahlamontada.com

## ئاگر

سەیری وردە ماسییە جوانەکانی ئەکرد
پولەکەی سپی و مەرجانی لەو ناوە
شەوقی خۆیان ئەدا بەو ئاوە
دوا چرپەی ئەوینیان ئەدرکان
ئەیاندا بە کاژی بڵند و بەردی بن کانی
ئەو لەتاو تای ئەشقی
دەستی خۆی ئەبردە ناو سینەو مەمکانی
ئەمبینی کە هەڵم لە ئاوی ئەو کانییە هەڵئەستێ
ئەویش وەك بەندییێك
ڕانی خۆی لە ڕانی خوڕەی ئاو ئەبەستێ



www.iqra.ahlamontada.com

## کانی قرژاڵان

ئێوارە کە تیشکی خۆرەتاو

ئەڕژایە نێو بەردە لووسەکانی کانیاو

ئەو تازە ئەتەگی لە سینە ڕادابوو

بە لەپی بچوك ومەڕمەڕی

ئاوی ڕوونی ئەکردە

ئەو کەزی و بسکانەی

بۆ مەلە بە سەریا بایدابوو

کە نزیك کەوتمەوە تازە ئەستێرەیێ

بەدیار جەستەی ڕووتی

ئاگری گرتبوو

ڕایکردو ئاوابوو



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەچمەوە باخچەکانی وەزیریە

کوپەیەکی پڕ لیرەم لە ناو گەڵادا جێهێشتووە
دڵێکی پڕ تاسەم لە کۆڕنیشی دیجلەدا جێهێشتووە
ساڵانێکی پڕ لە خەمم
لە مەیخانەکانی ئەوێ جێهێشتووە
لیرەکان ئەشکی ئەوین بوون
تاسەکان تاسەی هەزاران زام و برین بوون
خەمەکان خەمی چوار ساڵی ئاگرین بوون
دەتوانم بە وانەوە سەد ساڵی تریش بژیم
ئەچمەوە باخچەکانی وەزیریە
بانگی خۆشەویستەکەم ئەکەمەوە
ئەڵێم وەرەوە وا من لەو شوێنەدا وەستاوم
کە بە دیار چاوانتەوە رائەوەستام
گوێم لە قسە نەرمەکانت ئەگرت
ئەڵێم وەرەوە وا من لەو شوێنە وەستاوم
کە هەمیشە لەوێ چاوەڕوانیم ئەکردی
ئەچمەوە بۆ دەریاچەی رەزازە
یادەوەرییەکانم ئەهێنمەوە
دڵۆپە ڕژاوەکانی فرمێسکم هەڵئەگرمەوە
قسە ڕژاوەکانم کۆ ئەکەمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

مەلی هەناسە ساردەکانم ئەگرمەوە
ئەچمەوە سەر پردەکەی خاسە
چاوەڕوانییەکی زۆرم لە وێ جێهێشتووە
خورپەیەکی زۆرم لەوێ جێهێشتووە
تەنهاییەکی زۆرم لە وێ جێهێشتووە
چاوەڕوانییەکەم بۆ ئەو بوو
خورپەکانم بۆ ئەو بوو
تەنهاییەکانم  نەهاتنی یەکجاری ئەو بوو
ئەچمەوە قاوەخانەکەی بەرازیلی
شەکرە قسەکانی ئەهێنمەوە
فینجانە جوانەکانی قاوەکانمان ئەهێنمەوە
ڕەنگە ڕژاوەکانی ناو جانتاکەی ئەهێنمەوە
ئەو شەکرو فینجان و ڕەنگە ئاسمانیانە
بەشی هەزار ساڵم ئەکات



www.iqra.ahlamontada.com

## من باسی باکوورت بۆ ئەکەم باکوور

ئەچمەوە باکوور، دوورترین مەملەکەتی گیا
مەملەکەتی تەمتوومان
برادەرەکانی منالّیم هەموو لەوێن
لەوێ لە ژێر تاوێرە بەردێ
نامەی یەکەمین ئەوینی خۆم شاردۆتەوە
لەوێ زمان بەشی ئەو مەلەکووتە ناکات
بە ستیلی خەون دروستم ئەکاتەوە
لەوێ کتێبی بۆنی منالّیی ئەدۆزمەوە
لەوێ زەمان ئەبەدییە
زمان ڕستەیەکی خورافیە
لەوێ لە ناو ڕووباری گانگا
کە خوڵەمێشەکەی تاگووری تیا ڕژاوە
قسەم لە گەڵ کریشنا کردووە ئەچینەوە ئایندە
لە کاتدرائیەی سامباستا گومانم لەگەڵ شێکسبیر ژەنیوە
لە ناو گۆڕستانی خاك و خۆڵ نامەی نالیم خوێندۆتەوە
درودە پیرۆزەکانی بەلاغەتم لە دڵمدا هەڵگرتووە
من باسی باکوورت بۆ دەکەم باکوور
ئاخ باکوور چەند دوورە بە ئاستەم لە زەینم ماوە
وەك منی لکە گیا لە تۆی ئاو



www.iqra.ahlamontada.com

وەك نارام سین لە سەرچاوە دوورەکانی
دەزانی باکوور چەند دوورە
وەك نەی لە مەملەکەتی قامیش
وەك سامۆرا لە شمشێر
باکوور پڕە لە سێو ، سێوی ئەوین
سێوەکان ڕەنگاو ڕەنگن
ڕەنگەکان پر باق و بریق
بریقەکان هەمووی وێنەی تۆن شازادەی کاستالیا
وێنەی تۆ هەزار هەزارە لە ئاوێنەی نارسیسیم
بە دوای کام وێنەت بکەوم کوردیلیای من
دەرمانی لە هەزار ژەهر گیراوەی نادیار
کە ئەزانم بۆ هەر وێنەیەکت بچم
هەزاران هەزار جار ئەکەوم
ئاخ باکوور چەند دوورە شازادەی ئاوی کاستیلیا
باکوور وەك کتێبی ئاسۆ کە ئەگاتە بنی ئاسمان
تا ئەیگەمێ ئاوا ئەبێ
باکوور وەك قەڵەمی دەستی مناڵ
ئەوەندەی نووك ئەشکێنێ و هەمدیس ئەیتاشێتەوە
تا ئەگاتەوە دەستی من تەواو ئەبێ
باکوور پڕە لە ئاشق
ئاشقەکان هەمیشە نامە ئەنووسن



www.iqra.ahlamontada.com

نامەکان هەمیشە ناگەن ئەبن بە مەلی دەریاچەی وان
ئەزانی مردن لە باکوور چەند خۆشە
وەرە دەستت بدە دەستم بە یەکەوە ئەچین بۆ باکوور
ئەچینەوە سەر رووباری ئارنۆ
دانتی لەوێ چاوەڕوانی بیاتریس ئەکا
بەسەر گەسگەکە باز ئەدەین و هەرگیز لە یەك نابینەوە
لە باکوور هیچ کەسێ لەبەر تای ئەشق چاوی نابینێ
چاویان پڕ بووە لە وێنەی مەعشووقەکانیان
لە باکوور کەس لەسەر زەوی دیار نییە
هەموویان بە ئاسمانەوەن
ئاخر هەموویان بە دوای مەعشووقەکانی خۆیان لە
فڕیندان
من باسی باکوورت بۆ ئەکەم باکوور ئەنتیگۆنا
باکوور وەکو ئاگر وایە لە بەر هەناسەی داغی ئاشقان
وەك ئاو وایە لەبەر فرمێسکی ڕوونی ئاشقان
وەك  ئاهەنگ وایە لەبەر گۆرانی شازی ئاشقان
وەك باخی سێو وایە لەبەر دڵی ڕژاوی ئاشقان
مەملەکەتێکە لە سازو نەی
هەموو ئاشقەکان خەریکی چاندنی قامیشن
لە بەیانییەوە دەنگی نەیە تا بەیانی
لە باکوور کەس کاتی نییە بۆ قسە



www.iqra.ahlamontada.com

هەموو دەمیان لە ناو دەمی یەکتر ناوە
لە باکوور تاکێ نابینی
جووت جووت لەیەکتر ئاڵاون
سەریان لە بنگوێی یەکناوە
باکوور پڕە لە گۆزە، گۆزەی شەراب
بەینی خۆمان بێ باکوور ئاوە ئاوی سەراب
هەموو ئێوارەیەك قازو قوڵینگ ئەگەنەوە باکوور
باکوور سپی سپی ئەچێتەوە
سەراو سەر خۆیان داوێن
وائەزانن گەیشتوونەتە ئاو
چەند گوناحن نازانن باکوور ئاو نییە
فرمێسکی چاوە، چاو
من باسی باکوورت بۆ ئەکەم باکوور



www.iqra.ahlamontada.com

## تۆیش تۆیش ئەبەدی من

ئەزانم وەك نەرمە بایێ کە بەسەر گەڵا ڕەت ئەبێ
ئاواهی وەکو فنجانێ کە قاوەی بنی سووتابێ
یا هەر وەکو ئاوێنەیێ لە هەزاران جێ شکابێ
یا وەك بنە سیگارەیێ هێشتا دوکەڵی هەر مابێ
یا مینا پەیمانەی بە تاڵ
لە سەرخۆشێ بە جێمابێ
ئاوەها تۆ جێمئەهێڵی

*

ئەزانم وەکو سەمایێ کە بەسەر دڵما ئەیگێڕی
ئاواهی وەك خەراباتێ ساقییێکی تیا نەمابێ
یا وەك کتێبی وێرانەیێ حەرفەکانی لێ ڕژابێ
یا وەك تاقە گوڵێکی یاس
هێندەیان دەم پێوەنابێ
بۆنو بەرامەی پژابێ
ئاوەها تۆ جێمئەهێڵی



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوە منیش تاوەکو هەم
لەژێر سایەی ئەو تاقەدارە ئەوەستم
ئەوە خوایە مانگی ڕوخت هەڵێ و
جارێکی دیکەش بێیتەوە
یا وەك خۆری دوای بارانێکی پاییزی
لەناکاوان هەڵێیتەوە
منیش هەر لێرە ئەوەستم دەبا ئومێدێکیش نەبێ
هەتا ئەو ڕۆژەی کەگیا لەبەر پێیانم شیین ئەبێ

*

ئەزانم کە ئەگەڕێیتەوە بەفر سەری داپۆشیوم
فیراقی مەینەتباری تۆ خوێنی جەستەی پێ نۆشیوم
بەڵام چیبکەم هەتا خورپەی دڵ وەمینێ
ئەوین لە دەمار ئەگەڕێ و
تۆوی ئەبەد لەناو ڕۆحمدا ئەچێنێ.



www.iqra.ahlamontada.com

## زەنایێ لە هیچ

هەمووومان وەك پووشی ناو با
لە بۆشایی ئەم جیهانەدا ئەسوورێینەوە
با چۆنی بوێ ئاوا لەگەڵ خۆیمان ئەبا
هێندێکمان لە دارستانەکاندا بە دوای سێبەر
سێبەرێ تۆزێ دڵمان بداتەوە
هێندێکمان لە بارەکان بۆ مەستی
مەستییێك بۆ ئەسڵی خۆمان بباتەوە
هێندێکیشمان لە کێڵگەکان
چاوەڕوانی باران ئەکەین
بو لای گوڵەگەنمەکانمان بباتەوە
هێندێکمان لە هۆلە تاریکەکان
سەیری دوا دیمەنی ئۆڤیلیا ئەکەین
یا لە دۆزەخەکەی باربۆس
سەیری کونی کلیل ئەکەین
باندێ لە باخەکانی سنوور
هاکا لە ڕێژنەیەکا چەندانێکیان
دوانامەی خۆیان بۆ ژیان بنووسنەوە
چەند کەسانێ لە سووچی کتێبخانەکاندا
دوا لاپەڕەکانی ئەخاب لە موبی دیك ئەخوێننەوە



www.iqra.ahlamontada.com

هەمووماان لە بۆشایی ئەو جیهانەدا ئەسووڕێنەوە
هێندێکمان مەست
وەك ئەوەی پاشای کەون بێ
هێندێکما پەست
وەك ئەوەی ئێستا نا ئێستا دونیا تەواو ئەبێ
هێندێکمان لە باشور
هێندێ لە باکوور
هێندێ لە کانەکانی زێڕ دەبن بە مشتێ خۆڵەمێش
هێندێ لە مێترۆکاندا دوا قومی ئومێد
لە حەشیشی ئاگرین ئەدەن
بۆ عەدەم ئەگەڕێنەوە
مۆزیکژەنەکان لە باخەکانی باخدا
ئەبن بە دوا دڵۆپی دەریاچەی قوو
یا لە مۆزەخانەکانی پاریس و
گەرەکە میللیەکانی هەولێر
بەدوای جوانییەکانی ژیان ئەگەڕێن
منیش لێرە لە چیمەنێکی تەنها
لە چیمەنێکی دەورەدراو بە کۆنکریتێکی بێ مانا
دەورەدراو بە کۆمەڵێ جەردە
بە کۆمەڵێ کودێتای بن پەردە
سیخناخ بە کۆمەڵێ سەرخۆش



www.iqra.ahlamontada.com

که تەنها بۆ ئەوە مەست ئەبن خەو دایانگرێ
منیش لێرە لە سەر مێزێکی بچووکی یەك بە یەك
کە جارجارە هێند فراوان ئەبێ
جێی دونیای لێ ئەبێتەوە
ئەچمەوە ماڵە شڕەکەی بۆدلێر
کە لە سێوی گەنیو ئەچێ
یا لە گەڵ چەند شیعرێکی ڕۆمی و مەولەویدا
ئەچینەوە حوجرە گەورەکەی خودا
بەسەر پشتی بۆراقەکەی دانتی
سەرێ لە رامبۆی بەرەلاو
جاهیدی هەمیشە مەست ئەدەین
یا لەگەڵ وایتمەن  باسی گیا ئەکەین
هەندێ جاریش کەس لەکەس ناگاو شەڕ ئەکەین
سەیرکە ئێمە هەموو لە بۆشایی ئەم جیهانەدا
وەك پووشی دەم با ئەسوڕێنەوە
(ئاخر ئێمە کێین لە نێو ئەم جیهانە ئاڵۆزەدا؟ )
هێندە بە خۆمان هەڵئەدەین ؟



www.iqra.ahlamontada.com

## مەلەكووتی من

1

لە ناو مەلەكووتی مندا، نە فریشتە هەیە نە شەیتان

نە نیشتنەوەی ئاو هەیە نە تۆفان

تەنها ئەوینی ئەبەدییە

كە وەك شیری مەمكی دایك

ئەپڕژێتە باخی زمان

2

لەناو مەلەكووتی مندا، ژنێ هەمیشە سەما ئەكات

ڕووناكی كۆ ئەكاتەوە

درەختی خۆی پێ ئاو ئەدات

شەوان گۆزەی دڵم ئەدزێ

سپێدان ووردو خاشی ئەكات

3

لە ناو مەلەكووتی مندا، ڕێ ڕێ مەلەكانی نۆتە

ئەچنەوە ماڵی كۆنشیرتو

ڕستەكانی ناو كتێبی تەم وفیراق

نەسلی ژەنگاوی خۆیان ئەسڕنەوە

جاویدانی لە ڕۆحی مانا ئەچێنن



www.iqra.ahlamontada.com

4

له ناو مەلەکووتی مندا

گیا خوناوەی بەیان بانگ ئەکا

تەنهایی وەك ئاقیقی شین ئەدرەوشێتەوە

5

له ناو مەلەکووتی مندا، یاری نێوان خوداو شەیتان

پڕە لە داشی فریودان

یەقین بۆتە شمشێری ناو دەستی گومان

ڕیئاڵ ئەسپێکی بەزیوە لە ناو ڕایسێزی تەمتوومان

لە مەلەکووتی مندا، هەموو دێڕێ مانیفێستە بۆ دڵشکان

ئەوەی بەردەوام ئەبیسترێ هەر سەدایە

سەدای بێ وەڵامی ئینسان

6

له ناو مەلەکووتی مندا

ئاگرو ئەوین لە شەبەیخوونی ئەبەدین

وەهم سەرمەشق و سوارە

وەهمی گەیشتن بە لوتکەو ناخی زەمین



www.iqra.ahlamontada.com

7

له ناو مه‌له‌كووتی مندا، میتافۆڕ سوڵتانی كه‌ونه

تابۆ دێڕێكی كه‌وناره

له‌ناو گۆزه‌ی سپی شیعر

8

له ناو مه‌له‌كووتی مندا

بای وا هه‌یه دارستانه‌كان ناناسێ

گه‌ڕه‌ك هه‌یه یوتوپیایه هه‌م دیاره‌و دیار نییه

9

له ناو مه‌له‌كووتی مندا زێ هه‌یه له ده‌ریا ئه‌چێ

مرۆڤ هه‌یه له نووسینه‌وه‌ی كه‌وندا

له ستوونه نادیاره‌كانی خوا ئه‌چێ

كچان ئاون له شه‌به‌قدا

گوڵه‌كانی مه‌ریه‌م ساو ئه‌ده‌ن

كتێب له كوێ ده‌ست پێبكا

ماناكان بۆ وێ تاو ئه‌ده‌ن



www.iqra.ahlamontada.com

# میری مەحاڵ

چەند پێویستیم بە ئاسمانە
تاوەکو جێم لە زەوی تۆ ببێتەوە
چەند پێویستیم بەدەریایە
تا دڵۆپێ لەنووری  تۆ بدۆزمەوە
بۆوەی ئەوینت نەمکوژێ
من پێویستیم بە گریانە
من ئەزانم ئەبێ کەون داگیر بکەم
ئەبێ سەدان ساڵ کۆیلە بم
تا ساتێك ئازادی لە تۆ بە دەست بێنم
ئەبێ هەموو ئاگرەکان تاقی کەمەوە
تا لە مانای  سووتانی ئەوینت بگەم
ئاخ چەند پێویستیم بە ونکردنی خۆم هەیە
تا جارێ تۆ بدۆزمەوە
چەند پێویستیم بەخۆکوشتنی خۆم هەیە
تا لە جاویدانی تۆ بگەم
هەزار ساڵ ترسم پێئەوێ
تا بۆ ساتێ ئازایەتی لەبەرامبەر تۆ  بنوێنم
هەموو ئازادییەکان لای تۆن
تەنها منم تاقە دیلی تەلاری تۆ



www.iqra.ahlamontada.com

هەموو دەریاکان لای تۆن
تەنها منم تاقە تینووی ئەوینی تۆ
ئۆف ئۆف
چەند پێویستیم بە ئاشکرایی تۆ هەیە
تا لە نهێنی خۆم بگەم
پێویستم بە تەنهاییە
تا دەمێ هاودەمی تۆ بم
پێوستیم بە هەموو ڕێگاکانە
تا بکەومە سەر ڕێگەی تۆ
پێویستیم بە هەموو شمشێرەکانە
تا لە دەمی تیغی ئەوینی تۆ بگەم
من ئەمەوێ هەموو بینایی چاوەکان
لە چاوی خۆم کۆکەمەوە
تا بەشی بینینت بکات
من ئەمەوێ هەموو بیستنی گوێچکەکان
لە گوێچکەی خۆم کۆکەمەوە
تا بەشی بیستنت بکەم



www.iqra.ahlamontada.com

## مۆنادی درەوشاوە

سیزیف براکەم سیزیف
خوا ئێمەی خۆشناوێ و ڕقی لێمان ئەبێتەوە
ئەوەی ناکرێ پێمان ئەکا
لە هەموو یارییەکان لێمان ئەباتەوە
لە خاچی ئەبەدیمان ئەدا
ئاوی دەریامان پێ ئەگوازێتەوە
تیشکە ڕژاوەکانی خۆیمان پێ کۆ ئەکاتەوە
قەلامان پێ دروست ئەکاو
خۆلمان پێ ئەکێشێتەوە
شیعرەکانمان ڕەشئەکاتەوە و
مەحالمان پێ ئەنووسێتەوە
ئەوە نییە هەمیشە تۆ
بەردەکە بۆ سەرەوە ئەبەیتەوە
بەلام هەمیشە بۆ خوارەوەی گلۆر ئەکاتەوە
سارد نەبیتەوە، تیر لە کەمان ترازاوە ناگەڕێتەوە
ئێمەیش دوای تۆ
شانمان ئەدەینە بەر هەمان ئەو بەردە
بە هەمان عەزابی ئەبەدی
بەرەو هەمان لوتکەی ئەبەینەوە



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵام هەمدیس گلۆری بنار ئەبێتەوە
سیزیف براکەم سیزیف
خوا ئێمەی خۆشناوێ ڕقی لێمان ئەبێتەوە
گۆڕمان پێ هەڵئەکەنێ و ئێمەی تیائەشارێتەوە
میخکۆبی ئازاری کردووین
دیلی دەستی هەرماسی کردووین
ئاردی ناو درك و داڵمان پێ کۆ ئەکاتەوە
تۆپی زەویمان پێ هەڵئەگرێ
ئاسمانمان پێ ئەشواتەوە
چیرۆکی ئازارمان پێ ئەگێڕێتەوە
بەردەکەمان پێ ئەباتە سەر لوتکە و
هەمدیس گلۆر ئەبێتەوە
سیزیف
چا نەبوو تۆ مۆنادی خۆت هەبوو بۆنت ئەکرد
بەو مۆنادە چەند بەختەوەر بوویت
هاوڕێی ئەبەدیت بوو
ئەنیست بوو، جەلیست بوو
کتێب و قەڵەم و لیست بوو
هەموو ڕۆژێ وەك کۆرپەی خۆت
ئەتخستە سەر شان و ملت
بەرەو ترۆپك هەڵئەکشایت



www.iqra.ahlamontada.com

ئومێدی خەڵاس بوونت هەبوو
ئومیدی پاك بوونەوەت هەبوو
بەڵام بەردەکە لاسار بوو
گوێی بە ئازاری باوکی نەئەداو رایئەکرئەوە ژێر بنار
لە قووڵایی بەیەك ئەگەیشتنەوە
سیزیف سیزیف هاوڕێی هەمیشەی بەردەکە
واز مەهێنە
بەڵکو تۆزێ شل بێتەوە دڵی بەردەکە نەرم بێ
ئاخر ئێمەیش لە دوای تۆ هەمان بەردمان پێ ئەبڕێ
ئەوە قەدەری مرۆڤە تەواو نابێ
چەند بۆ سەر لوتکەکەی ببەی
دیسان گلۆر ئەبێتەوە و بۆ بنار ئەگەڕێتەوە
بەردەکە بەردەکە، کەی لە لوتکەدا قەرار ئەگری
تۆیش بێ ئەوەی زمانت هەبێ
گۆرانی مەرگمان بۆ ئەڵێی
بێ ئەوەی کە دەستت هەبێ
وەك ژەهر ئەمانپاچی
بێ ئەوەی کە دڵت هەبێ ڕقت لێمان ئەبێتەوە؟
وەك دەمی تیغ ئەمانبڕی

* مۆناد : گەوهەری تاقانە



www.iqra.ahlamontada.com

## پاییزی فینۆف

### پراگ

له سێنترۆمی پراگدا کچێك گۆرانی ئەچڕی
له ماناکەی نەگەیشتم
بەڵام ئەمزانی که باسی ئەوین ئەکات
له سێنترۆمی پراگدا کوڕێك ئەگریا
له ماناکەی نەگەیشتم
بەڵام ئەمزانی که باسی فیراق ئەکا

### له ژێر پەیکەرەکەی مارتن

من بەڕەگەز ئەچمەوە سەر گڵە سوورێکی سلۆڤاکی
بەشێکی خوێنم شارییە
بەشێکیشی هی دەشتاییەکانی باکوور
دەمێك لەبەر قاپی خودا
دەمێك له ناو ماڵی شەیتان
دەمێك ئاژەڵێکی کێویم
دەمێکیش دیلی دەست ئینسان



www.iqra.ahlamontada.com

## قەڵاکانی نۆرنبێرگ

له نورنبێرگ گەڕامەوە بۆناو قەڵا دێرینەکانی تزاران
کە چواردەوریان بە ئاوی چیا ئابلۆقە دراوە
کچەکانی قەڵاو ئاو تێکەڵ بووبوون
بەر لەوەی لەشکر هێرش کات
لەتاو جوانی ئەو کچانە
هەرهەموویان چۆکیان داداو گەڕانەوە بۆ مەیخانە

## کۆشکەکەی پۆتسدام

لە کۆشکە جوانەکانی قەیسەرەکانی پۆتسدام
چوومەوە ناو کتێبە کەونارەکانی مێژوو
پەڕەکانی هێندە زەرد هەڵگەڕابوون
هاواریان ئەکرد
بەچاوی خۆم یەك یەك پاشاکانم بینی
لە دەرگای کتێب ئەهاتنە دەرەوەو حەپەسابوون
کە ئاوڕم دایەوە ئەسپی پەیتونوانەکان
لە کوڕژنیان ئەداو
هەمو چوار ناڵە وەستابوون



www.iqra.ahlamontada.com

## بەسەر ڕووباری ڕاینەوە

کەبەسەر ڕووباری ڕاین دا وەستام
کچێ تازە لە سەمای ناو بارەکان ئەهاتەوە
کوڕێ تازە لە مەیخانەکان هەڵسابوو
نەوڕەسێ تازە گەیشتبووە کەناری ئاو
پاپۆڕێ تازە هەڵم لە هەڵمدانی هەستابوو
لە دوورەوە ئەمبینی بە هەموو هەستەکانم ئەمزانی
هەرچی جوانی بوو لە ڕۆخانەی کوێڵندا وەستابوو

دەریاچەی ڤانزێ

لە دەریاچەی ڤانزێدا دوو مراوی و دوو نەوڕەس و
دوو کچی قەرغیزیم بینی
وەك دوو مانگ لەناو باراندا هەڵێن
یان وەك دوو پەری لە کۆڕنیشەوە دەرکەون
جوانیان ئەبەخشی بە ئاو
تاقەتی مانەوەیان ئەدا بە کەون



www.iqra.ahlamontada.com

## بەرامبەر رایشتاگ

کە ئاوڕم دایەوە هیتلەرم بینی
بە بزاوتێکی دەستی
یەك ملیۆن سەرباز ڕاچڵەکین
تەزوێ بە گیانم داهات
هەناسەیەکم هەڵکێشا هێندە سارد بوو
یەك ڕەوە نەوڕەس ڕاتەکین

## کەڵێسای ژنان

لە کەڵێسای ژناندا
پیاوەکان لە بەرامبەر پەیکەری مەسیح
لە خودا ئەپاڕانەوە
ژنەکانیش مەمکیان لە دیوار هەڵئەسووی
تا شیریان لەناو بگەڕێ و وەچەی تازە بنێنەوە



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەسپەکەی فریدریش

ئەسپەکەی فریدریش ئێستاکەش ئەحیلێنێ
فردریش هێشتاکەش بەسەر زینەوە
خۆی و پاڵتۆکەی هەرماوە
شمشێری حوکمرانێتی لەدەستە
بەڵام نازانێ شکاوە ...

## ئێوارەیەك لای بتهۆڤن

خۆم بینیم ئاوازەکانی بە دیواری ڕۆح واسیبوو
هزری لە مۆزیکای- بۆن- ڕاگرتبوو
کە چوومە ماڵەکەی نۆتەکان هەمووی ڕژابوون
ئاوازەکان کاڵ بووبوونەوە
هێندە بەڕووی زەمەن و زمان پژابوون

## ڕووباری شپرزێ

بەرلین گەڕایەوە ناوخاك لەگەڵ بەردو دار یەکسان بوو
بەرلین گەڕایەوە بۆ ئاسمان
لەسەر ڕووباری شپرێیدا وەستام



www.iqra.ahlamontada.com

گوێم گرت لە هاواری ئینسان
هێندێکیان کز
هێندێکیشیان وەکو ڕیتمی کپی گریان

## ئێزیدییەکانی بیلەفێلد

لالش هەمویان ڕائەکێشێتەوە ناو زێد
بێلە فێلدیش هەموییان ئەگەڕێنێتەوە بۆلای خۆی
چی بکەن لە میانی زێدو جوانی؟
ئەبێ بۆ ئەبەد لە هاتووچوون دابن

## فڕۆکەخانەی بۆخارست

ئاسمانێك لە باو بۆران ، ئاسمانێك لە جوانی
ئاسمانێك لە هەور، نەخۆشێك لەناو فڕۆکە
مەلێك بەسەر دەرختەوە
یەکێك بەسەر کتێبەوە
ئاخ مرۆڤایەتی وەك نەخۆشەکەی ناو فڕۆکە ئەناڵێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

## بیرەی فریش

پۆتسدام پلاتز شووشەو ئاسنە
لە شوشەکاندا جوانیم ئەبینی
لە ئاسنەکاندا بەندیخانە
لە شووشەکاندا
کچەکان وەك گەوهەر دیاربوون
لە میلی ئاسنەکاندا مرۆڤ وەك بەندی
دانیشتم بیرەی فریشم خواردەوە

## تاوەری بەرلین

لە بڵندترین بورجی بەرلیندا
سەیری هەولێرم کرد
بەڵام هێند بەرزو جوان بوو
زانیم من لە شوێنێکی چەند نزمم

## باد فراین ڤالد

وەکو چەقۆ جگەری ئێستەتیك لەت لەت ئەکا
کچە جوانەکان پەرتی ئەوبەرو ئەوبەری خۆی ئەکا



www.iqra.ahlamontada.com

بۆیە هەر عاشقەو لە دوورەوە
سەیری مەعشوقی خۆی ئەکا

## پاییزی ڤینۆڤ

لە ڤینۆڤدا پاییز ئەگاتە دوا ناڵەی تراژیدی خۆی
لە ڤینۆڤدا هەرچی زەردی دونیا هەیە هەڵیدەمژێ
لە ڤینۆڤدا پاییز پاییزی خۆی ئەکا

## رووباری ئۆدە

لەسەر سنووری پۆڵەندا
چەکوشێك دوا هەناسەی ئەدا
دەمی لە ئاوی ڕووباری ئۆدر چەقی بوو
داسێك وەها تووڕ درابوو
کەوانە و قەفتەی لە گڵی- ئۆدە- تەقی بوو
جوانی ئیمبراتۆریەتی خۆی دائەمەزراند



www.iqra.ahlamontada.com

## گۆڕەپانی بورگەر تور

که ناپلیۆن هەردوو ئەسپە جوانەکانی
سەردەرگای شاری بەرلینی دزی و
بردیەوە نیشتمانی خۆی
بەرلین بێ ئەسپ مایەوە
هیتلەر بەرلینی وێران کرد
بەڵام هەردوو ئەسپەکەی سیمبۆڵی هێنایەوە

## کۆنفرانسی کێشکەکان

لەلای پەیکەرەکەی تەلاری دۆما
بەستەیەك قەسەر ڕژابوو
چی کێشکەی شاری بەرلین بوو
هەمووی لەوێ ئەیانجریواند
بۆنی نیشتمانی یەکەمیان
بەسەر سیمایان پژابوو



www.iqra.ahlamontada.com

## رۆتە راتهاوس

کەس نازانێ پاییز درەختی چەند خۆشئەوێ
کە دەمی لە دەمیا ئەنێ
شارەوانی سوور بە هەموو خەمباری خۆیەوە
لەبەردەمیا چۆکئەدات و پێئەکەنێ

## چێشتخانەی فینۆف

لە چێشتخانەکەی خودادا لەززەت وەڕەسی ئەپاچێ
مرۆڤ و فریشتە بە یەکەوە شەرابی پاك ئەخۆنەوە
بەیەکەوە داری گەنم ئەڕنن
لە چێشتخانەکەی خودادا شیعرو هەنگوین تێکەڵ
بووینە
کەس سەری لەو جوانییە دەرناچێ



www.iqra.ahlamontada.com

## یاد

بۆ سەعاتێ چوومە شەڕی کالیگۆلا
جوانی هێندەی کۆت و زنجیر خستە ملم
هێندەی جەستە هەڵمژیم
پاڕامەوە کە دونیا پڕ کالیگۆلا بێت

## بانهۆف

لە بانهۆفدا ژێرخاك گۆڕستان نییە
لە بانهۆفدا ژێر خاك هەزار ناوی هەیە
هەزار هەزار دەرگەو پەنجەرەو چاوی هەیە
مرۆڤ وردە وردە بەرەو ژێرخاك ئەچێتەوە
ئەگەڕێتەوە نیشتمانی ئەسڵی خۆی



www.iqra.ahlamontada.com

## ئوبان

له شۆستەکەی ئوباندا
کوێرێکم بینی کتێبی ئەخوێندەوە
له کتێبخانەی گشتیدا هرسێکم بینی
جگەرەی ئەکێشا
کچ و کوڕێ دەمیان له ئەمی دەك نابوو
ئەو دەمە بۆ ئەوان زەوی کەسی تیا نەمابوو

## ڤارتا

ئەو شەوە منی ئەبەنوس
کەوتمە ناو کاسەی شیری تۆ
دڵۆپ دڵۆپ وجودی ڕۆژهەڵاتیی من
له ئاوێنەی سینەی تۆدا ئەتوایەوە
من بەیەك بریقەی چاوت
تەواوی ئۆکرانیا گەڕام
من بە یەك بریقەی جەستەت کۆتاییم هات
ڤارتا ئێستا من بێ دڵ ئەسوڕێمەوە
دڵم لای تۆ بە جێماوە

**بەرلین پاییزی 2010**



www.iqra.ahlamontada.com

• یەکێ لە گەورە ریفۆرمیستەکانی کریستیانەکانە
• رزگارکەری ناوچەی دریسدن ئەڵمانەو پەیکەرەکەی لە شاری )دریسدن ە .
• بیتهۆفن، پەیکەرەکەی لە شاری بۆن ی ئەڵمانیایەو ماڵەکەشی لەوێ بۆتە گەلەری.
• رووبارێکە بە ناو هەموو بەرلیندا رەت ئەبێ .
• گوندێکی نێوان سنوری پولەند و ئەڵمانە.
• رووبارێکی نێوان پولەندو ئەلمانە.
• مەیانێکی گەورەی ناو بەرلینە ئەو پەیکەرەی لێیە، کە ناپلیون بۆ فەرەنسای بردەوە و پاشان هیتلەر هێنایەوە
• مەیانێکە لە بەرلین
• وێستگەی شەمەنەفەر



www.iqra.ahlamontada.com

## سووڕی زمان

1

ئەمەوێ بە چەشنێ بتنووسم قەڵەمم گڕ بگرێ
بەوچەشنە کە نووسیم قەڵەمم گڕی گرت
گڕی گرت قەڵەمم بەو چەشنە کە نووسیم
کەنووسیم بەو چەشنە قەڵەمم گڕی گرت
قەڵەمم کە نووسی گڕی گرت بەو چەشنە
نووسی کە قەڵەمم بەو چەشنە گڕی گرت
ئەمەویست بتنووسم بەوچەشنە قەڵەمم کوژاوە

2

ئەمەوێ بە ڕەنگێ ماچت کەم زمانم بسووتێ
زمانم سووتا بەو ڕەنگەی کە من ماچم کردی
ماچم کردی کە زمانم سووتا بەو ڕەنگە
زمانم سووتا بەو ڕەنگەی کە کردم ماچ
زمانم کە سووتا بەو ڕەنگەی کە ماچم کردبووی
کردبووم ئەو ماچە بەو ڕەنگە کە زمانم سووتا
ئەمەویست ماچت کەم بەو ڕەنگە کە زمانم کوژاوە



www.iqra.ahlamontada.com

3

ئەمەوێ بە دەنگێ دوات کەوم با بمبا
دوات کەوتم بەو دەنگە با هات و بردمی
بردمی ئەو بایە بەو دەنگە کە ویستم دوات کەوم
ئەو بایە بەو دەنگە بردمی کە دوات کەوتم
ئەمەویست دوات کەوم بەو دەنگە با جێی هێشتم

4

ئەمەوێ بە جۆرێ لە خەونت ببینم شەو کۆتایی نەیەت
کۆتایی نەیێ شەو بەو جۆرە لە خەونت ببینم
لە خەونا من تۆم دی شەو کۆتایی نەهات بەو جۆرە
نەهات کۆتایی شەو بەو جۆرە کە هاتیە خەونمەوە
ئەمەویست بەو جۆرە لە خەونا بتبینم شەو کۆتایی
هات



www.iqra.ahlamontada.com

5

ئەمەوێ بەگورزێ وێنەی تۆ
لە دڵما بکێشم کە خوێنم وشك کا
کە خوێنم وشکی کرد بەو گورزە وێنەی تۆم کێشا بوو
وێنەی تۆم کێشابوو کە خوێنم بەو گورزە وشکی کرد
کێشابووم بەو گورزە وێنەی تۆ کە وشکی کرد خوێنم
ئەمەویست بەو گورزە وێنەی تۆ بکێشم
خوێن هەر وشکی نەکرد



www.iqra.ahlamontada.com

## من له ده‌شتاییه‌كانه‌وه هاتووم

1

من له ده‌شتاییه‌كانه‌وه هاتووم
تا دێ منالێم وه‌كو ئه‌سپه‌شێ
دوور ئه‌بێته‌وه به تاو ڕائه‌كا
سایه‌دم كه زێی یاده‌وه‌رییه‌كان
وه‌ك ڕه‌شه‌بایێ له من هه‌ڵئه‌كا
ئێسته نا ئێستا ڕێژنه‌یێ دێت وبه‌سه‌ر برینی منا دائه‌كا

2

له ده‌شتاییه‌كانه‌وه هاتووم
ئێستاكه‌ش هه‌روا بۆنی خاك و خۆڵ
ئه‌مباته‌وه بۆ دڵۆپه‌ی باران
ئێستاش شه‌ونمی ده‌م بیره ئاوه تاڵ و سوێره‌كان له
ڕۆحم ماوه
ئێستاش پشكۆی ئاگردانه‌كان له‌سینه‌مدا ئه‌بریسكێته‌وه
تووترك ناوله‌پی ڕه‌ش كردووم
گۆماوه‌كان ڕوخسارییان پڕ له باركردووم
په‌نجه‌كانم هووڕه فێری سه‌مای كردوون



www.iqra.ahlamontada.com

3

له دەشتاییەکانەوە هاتووم

دەمم تامی شیری گەرم و خاوی لێدێ

دڵم پڕە لە حەسرەتی بەفر

خوێنم ڕەنگی خەرمانەکانی گرتووە

لەوەتەی هەم خەون بە شاخەکانەوە ئەبینم

لە دوورەوە بانگی کاژەکان ئەکەم

هەمیشە بۆ ڕەوەی مامزان ڕائەکەم

4

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

ئەزانم کەی هەور دێ و کەی با هەڵئەکا

کەی باران دێ و کەی دائەکا

کەی بروسك حەویقی ئاسمان شەق ئەکا

ئەزانم کەی دوا ئەستێرە دائەڕژێ

کەی گوڵەگەنم پڕ شیر ئەبێ

کەی باقە گیا سەما ئەکا



www.iqra.ahlamontada.com

5

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

لای کێڵگەکان مەلم دیوە

دەمی لەناو دەمی مەعشوقی خۆی ناوە

بە ڕەوە ئاسکم بینیوە خەمگینانە

سەریان لە ناو باڵیان ئەناو ئەگەڕانەوە کوێستانان

جار جار ئاوڕیان لەتەرمی جێماوی خۆیان ئەداوە

زەریم دیوە ڕوخساری خۆی بە حاجیلە هەڵگرتووە

دەستی لە خەنەی خاك ناوە

چاوی بە ڕێحانەی رەشی بەستاوەکان ڕشتووە

6

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

دایکم هەمیشە بوخچەی جلەکانمی پڕ لە پەلکە لیمۆ ئەکرد

ئێستاش بۆنی پەلکی لیمۆ

شیرازم بیر دێنێتەوەو مەستم ئەکا

ئێوارانیش کاتێ کەوا ئەچوومەوە

لەبەر بیرە ئاوەکەی دێ ڕووت و قووتیان ئەکردمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

7

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

ئەزانم چەند جۆرە ئاگر هەیە

کام ئاوازو کام نەی هەیە

چەند عاشق و مەعشوق هەیە

هەموو قەتێکان ئەناسم

لانەی هەر هەموو مەلەکان پێئەزانم

8

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

چەند هاوڕێیەکی مەڕ و

چەند گۆمیلکەیێ لە ئاو و

سێ چوار درەختێ لە سامالٚم هەبوو

ژیان بریتی بوو لە چەند شکارتەیێ

چەند میلێ لە ئاسمان

چەند ورشەیێ لە شنەی با

چەند ئاوازێ لە شمشاڵ



www.iqra.ahlamontada.com

9

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

لە ژێر ڕوونایی مانگەشەو

بیرمان لە خوا ئەکردەوە

لەناو پاوانەکانا گۆرانیمان ئەووت

لە گۆماوەکاندا سەیری ئەو ژنانەمان ئەکرد

خۆیان بە ئاوی کوڵاو ئەشوشت

10

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

ئێستاش شێوەی بیرکردنەوەم ئاسۆییە

ڕۆیشتنم، قسەکردنم ئاسۆییە

هەتا مۆزیکی شیعریشم ئاسۆییە

ئاسۆیی ڕائەکەم، ئاسۆیی گۆرانی ئەڵێم

زۆر جار لەناو ئاسۆدا خەوتووم

بەڵام ستوونی هەڵکەوتووم

11

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

هەمیشە خەونم بە چیا ئەبینی

خەونم بە دارستانی چڕو بە ڕووباری قووڵ ئەبینی

خەونم بە باکوور ئەبینی، باکووری دوور



www.iqra.ahlamontada.com

12

سپێدان دایکم قۆغەیێ شیرو یەکدوو هێلکەی بۆ ئەکوڵاندم

جانتایەکی پەڕۆی بەشانەوە ئەکردم

مامۆستای قوتابخانەش بە ئەلف و بێی برایم باڵدار

منالّی لێ هەڵئەمژتم

ژەنگی جەهلی لێ ئەکوشتم

13

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

لەتەنوورەکاندا کولێرەی نوورم فڕاندووە

لە نێو دڵی لەودەکاندا

هێلکەم لە ژێر زێری درەوشاوەی کا دزیوە

لە قەرسیلەکاندا شەونمم کۆکردۆتەوە

لە ناو تەبارەی گەنمدا سێبەرم بۆخۆم چنیوە

14

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

هێشتا مۆرانەی کینە دڵمی نەسمیوە

ماسکم لە ڕوخسار نەکردووە

زمانم سپییە، دڵم سپییە

هێشتاش حەزم لە دونیای دەشت و کپییە



www.iqra.ahlamontada.com

15

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم

ئەزانم کەی کۆڕەوی قولَینگان ڕەت ئەبیّ

کەی پەڕەسیّلکە دیّنەوە

کەی یەکەم تروسکەی ئاگر، لە ئاگردان ئەکریّتەوە

کەی گویّم لە یەکەم هاواری شوان ئەبیّ

ئەزانم کەی شیر لە گوانان میوان ئەبیّ

16

من لە دەشتاییەکان هاتووم

تاکە چەکم پیشەقان بوو

پیرۆزترین کتیّبی من

تەنها خویّندنەوەی ئاسمان بوو

کیّبڕکیّم لە گەلّ با کردووە

قوڕادەم لەگەلّ شوان خواردووە

ئەزانم چەند هەزاران جار

هاوارم بە هەورە تریشقە مردووە



www.iqra.ahlamontada.com

17

من لە دەشتاییەکانەوە هاتووم
لەبەرزایی گردەکاندا سەیری مانگم کردووە
لە گۆماوەکاندا ئەستێرەم ژماردووە
لە جۆخینەکانا دەندەرۆشکم کرتاندووە
ئەزانم چەند قەپێلکە شەیتانۆکەم شکاندووە



www.iqra.ahlamontada.com

## دواجار هەمووما‌ن شێت ئەبین

هەندێ ئەچینەوە نێو بەڕیا، شوێنە خۆشەکەی ئازادیی
لەوێ جگە لە سەدای خۆمان هیچی دی نابیسینەوە
جارجار قەدەر ڕامانئەداتە نێو مێترۆکان
دەست لە ملی ئەفیون ئەکەین
هەندێکمان بەرامبەر ئاسمان ئەوەستین
ئەچینەوە خەتی دونکیشۆت
شەڕی خۆر و مانگ ئەکەین
یا بە نێو کوچەو کۆڵانەکاندا بەدەم گریەو گۆرانی
رائەکەین و رائەکەین و رائەکەین
مناڵان ئێمەیان خۆشئەوێ
بەرد بارانمان ئەکەن
ئەگەڕێینەوە ئەشکەوت و چرای زەینمان ڕائەخەین
هەندێکیشمان بەسەر شەقامەکانەوە
کتێبەکانمان تووڕهەڵئەئەین
خورافەی شاعیرێکی شێت ئەخوێنینەوە
هیچ کەسێ لە ئێمەی راکردوو



www.iqra.ahlamontada.com

راکردووی دوای وەهم و جوانی
راکردووی دوای خاك و خۆل
دوای دادو میهرەبانی
رزگاریمان نابێ لەو قەدەرە
هەمیشە ئەبێ ڕابکەین و ڕابکەین ڕابکەین
لە فلیمی پەپولەکان وەڕەس نەبین
تا مۆرانەی کۆیلێتی لەسەرمان نەداو
لە ناو دیوارەکانی کافکادا مەسخ نەبین
عەجەب ئێمە کەسانێکین ئاوریشم ئەبەشینەوە
گیرۆدەی دەستی ڕۆژگاری ئاوا ئەبین
هاملێت هێی هاملێت
سعاتی دانیمارك چەندی ئەوێ بۆ شێت بوون
ئێستاکە هەبین یا نەبین؟



www.iqra.ahlamontada.com

## جوانییەکانی دۆنکیخۆتێ

چیتر چیرۆکی سوارچاکی ناخوێنمەوە
ئێستا هاتوومەوە خۆم و شمشێرم داوە بە کاڵان
سانشۆی برا قەیسەرەکان بە پەلکە شووتی نارووخێن
بە سواری پشتی ئەسپەشێ ئاوی دەریا تەواو نابێ
لەگەڵ بە سەرچوونی زەمان
زۆرتر بیر لە زاتی خۆمان ئەکەینەوە
کەمتر ئاسۆی گیا ئەبینین
زۆرتر بەرەو سارای وجود ئەچینەوە
لەگەڵ بە سەرچوونی زەمان
زۆرتر ئەگرین بەڵام کەمتر پێئەکەنین
زۆر جار بە سەر ئاو ئەکەوین
بەڵام زیاتر بۆ قووڵایی ئەبینەوە
لە گەڵ ڕابردنی زەمان
ئولفەت بە لامانشا ئەگرین
بەڵام شاباڵی فڕینمان لە شەقەی جوانیی ئەکەوێ
لە نهێنی بێداری و بێدادی ئەگەین
ڕێی دووری تەمتوومان ئەبڕین
دەگمەن خەومان لێئەکەوێ



www.iqra.ahlamontada.com

کەمتر قسە ئەکەین
زۆرتر  لە دنیا ئەڕوانین
لە گەڵ ڕابوونی زەمانە
ئاوی سەر تاوێرە بەردان ئەخوێنەوە
زیاتر بەرەو دارستانی منداڵی ڕائەکەین
ڕەشەبا کەمتر ئێرەیی بە گەلای جەستەمان ئەبات
زەمەن زۆر لە مامۆستاکان باشتر
لە کارتەمان ئەداو تێری پەندی خۆیمان ئەکات
فێرمان ئەکات چۆن با بگرین
یاری بە بروسکە بکەین
چۆن لەسەر ئاوەکان بڕۆین
ئاگر لە خۆمان لوول بدەین
فێرمان ئەکات باسکی قووڵایی بگرین
لە تەنکاوان لەنگەر نەگرین
سیرڕەی هەڵۆیان ئەتوانێ دیوار و قەفەسان ببڕێ
گمەی کۆترە ئەتوانێ قەفتەی خەنجەر وردوخاش کا
هەڵمی سەر شووشەی دڵی شکاومان زوو زوو بسڕێ
بەڕابردنی زەمانە
پەیمانەی ڕژاوی ئەوین پڕ لە شەراب ئەبێتەوە
خەونی بەسەرچووی منداڵی بە حیکمەت شین ئەبێتەوە
بە ڕابردنی زەمانە



www.iqra.ahlamontada.com

سەبەتەی دەست پڕ لە سێوی ئەزەل ئەبێ
ئەسپ لە ئایندەوە دێ ڕابردوومان
بەرەو ترۆپکان تاو ئەدا
مانای شیعری جاویدانی کێلگەی ژاکاویی ئاو ئەدا
هەموو شتێ بە رابردنی زەمانە
لەناو هێلانەی ئەبەدی خۆی ئەسرەوێ
تەنها دڵی ئینسان نەبێ
کز کز، کز کز ، کز کز،
ڕووناکی ئەبەشێتەوەو بۆ لای ماڵی مەرگ ئەچێ
بۆ تا هەتا لە لێدانی خۆی ئەکەوێ
دڵەکەم سانشۆ تۆ چەند ئازیز و بە وەفای
نازانم تۆ لەرەگەزی شەیتانی یان لە خودای؟



www.iqra.ahlamontada.com

## وەرەوە فاتیمە وەرەوە

ئەچووینە سەرابە دوورەکەی گۆڕستانی چۆلی
شمشێری وەستاوی منارە
کە ئێستاش هێماکان
بەسەر خشتەکانی دیواریا هەر ماوە
بەردە سپییەکانمان ئەهێنا و
نەزرمان لە کێلان گیر ئەکرد
خودایە لای یەك بین
خودایە بۆ یەك بین
من کەوتمە باکوور و تۆ باشوور
من بوومە هی کونجی غوربەت و
تۆ بوویتە هی گریان
لە بانێکدا
سەیری ئەستێرەی لەیل و مەجنوونمان کردووە
ئێستا نا ئێستاکێ هەر خۆیان لێکئەدەن
تا بپاڕێینەوە بۆ یەك بین دوعامان قبووڵ بێت
منالیمان لەگەڵ سەگەکەی گۆڕستان بردە سەر
بە پەنجەی بچووکمان
شیری ژێر زەویمان هەڵئەمژی



www.iqra.ahlamontada.com

پێما وابوو ئەم شیرە
لە جۆگەوجۆباری بەهەشتا
ئەپڕژێتە پەنجەی بچووکمان
فاتیمە بیرت دێت
پەنگرمان لە ئاگردانەکان ئەدزی
تۆش ئاردی ناو کەندوو بۆ قاویت
فاتیمە وەرەوە فاتیمە
ئەو ڕۆژانەی لە دەشتاییەکانا
بارانێ ئەباری و زەوی تۆزی ئەکرد
خۆمان لە باوەشی یەکئەناو
دوو چاومان دائەخست
لەرزێ دائەگرتین لەرزێکی خوداوەندی بوو
شەرمێ دائەگرتین شەرمی جودابەندی بوو
بریا ئەتزانی شەوەکان
چەند پڕ سام و درێژ بووینەوە فاتیمە
کە تۆ لە ژێر تریفەی پڕی مانگەشەوانیا نەماوی
پێەشتەکان چەند چۆلن فاتیمە
کە تۆ وەك ئاسکەکان ڕاناکەی
هەندێ جار هەست ئەکەم
ئەم دونیایە چۆلترە لە ئەشکەوتە دوورەکان
تازە ژین فاتیمە چ تامێکی ماوە تۆ نەبیت



www.iqra.ahlamontada.com

تازە من چۆن گۆرانیەکەی جارانم بڵێمەوە
کە تۆ ووشەکانی نەبیستی
ئاخ دڵم چەند توندە فاتیمە وەرەوە
ئێمە بە یەکەوە بووین
کە هێشتا پەڕەسێلکە نەهاتبوونەوە
بیرتە پووشی تازەمان ئەنایە ناو لانە کۆنەکان
تا درەنگان
تا ئەو کاتەی مەلی تیشك ئەمردن لە ئاسمان
وەرەوە فاتیمە وەرەوە
دەشت و دۆڵمان ئەبڕی قەتێمان داو ئەکرد
ئاگرمان لە پەنا بەردو تاوێرەکان ئەکردەوە
ڕۆحمان شەلاڵی بارانی ناوەخت ئەبوو
ئاخر ئەزانی فاتیمە
ئەو ساتانە چەند خۆش بوون
ژیان سادە، قسە سادە، دڵەکان سادە
تەمەشا فاتیمە تەمەشا برینم  سەت دیوە
قسەی  دڵم چەند بە سفت و سۆیە
تەمەشا فاتیمە تەمەشا



www.iqra.ahlamontada.com

# دوا گریانی دانتی

1

چەند درەنگ هاتی پیاتریس
ئەی شەرابی ئەشکەوتەکان
دەنکە شەونمی خودایی
شووشەی شکاوی ناو دەستی جەنگاوەران
ئێستا لافاو نیوەی کتێبەکانی بردم و
باران هەموو شیعرەکانی ڕەشکردمەوە

2

چەند درەنگ هاتی پیاتریس
من هەزاران تاجی شکۆم
لە پەلکە گیای باخی زەیتون
بۆ تاجی سەرت چنی بوو
دڵۆپە مۆروی غوربەتم
لە بەندەرو لێوارە تەماویەکانی
ئاوی بوخارا هێنا بوو
هەزاران ئاسکی نوورم
لە تەبەقەی حەوتەمی ئاسمان هێنابوو
گەوهەری شیعرو ئاوازم



www.iqra.ahlamontada.com

له  بنی دەریای زمان و

له دەمی نەهەنگی ملفل دەرهێنابوو

3

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

هێندە ڕێگەو تەلانی شیعرم بڕیوە

ئێستە زەینم پڕە لە بەردەڵانی ڕێ

ئەو ڕێیانەی هەمیشە ئەیانبردمەوە

ناو تەپ وتۆزی جەنگەکان

هێندە کتێبە کەونارەکانی ئەوینم خوێندۆتەوە

ئێستە ڕۆحم پڕە لە تۆ

4

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

وەرە سەیری برینم بکە

ئەوسا ئەزانی ئەو شەڕانەی

کەوا من لێی هاتوومەوە

چەند سەخت بوون

ئەو شەرابەی من لە کوپەی

بەندییەکانم خواردۆتەوە

تامی چ ئازادییێکیان بەمن بەخشی



www.iqra.ahlamontada.com

5

چەند درەنگ هاتی ئەزیزم

وەرە دەست نێ بە توێلمەوە

ئەوسا ئەزانی چەند گەرمە

ئەوە گەرمی ئەو هاوارو نالّینەیە

کە لە مەیدانی بۆنخوێنی کۆیلەکاندا شێتی کردم

ئەوە تای ئەو فیغانەیە کەلە ژنانی ڕێ بیستم

6

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

ئەو کتێبانەی هێنابووم

هەرهەموویانم تەواو کردو هەر نەهاتی

تەرمی هەموو ئەو مەلانەی

لە شەبەیخوندا بەسەر شانما نیشتنەوە

هەر هەموویانم شاردنەوەو هەر نەهاتی

7

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

بینابیم پڕ دوکەڵ بووە

هەناسەم پڕ لە زێماری بێ ئاو بووە

بیستنم پڕ لە هاواری بێ ناو بووە

زمانم پڕ لە فەریادی خنکاو بووە



www.iqra.ahlamontada.com

8

ئاخ، چەند درەنگ هاتی پیاتریس

هەزاران شەو شمشێری خەوم شکاندو

شیعرم لەسەر برینی ڕۆحم داناوە

لەناو دەیان هەزار دەریا

ئاقیقی شینم هێناوە

بەناو سەرتاسەری زەوی سووڕایمەوە

هەتوانم بۆ باڵی شکاوم هێناوە

9

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

تازە کەی فریام ئەکەوی

نەچاوم ماوە تا بەرگەی

نووری هەزار ڕەنگت بگرێ

نە دەستم ماوە تا قەفتەی دەستت بگرێ

کتێبەکانم وەها زەرد هەڵگەڕاون

ئەڵێی شکارتەی گەنمێکی

هەزاران ساڵەی بێ ئاون



www.iqra.ahlamontada.com

10

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

تۆ ئاگرو ئاوی من بووی

ئەی تەونی هەزاران رەنگی من

کە ئاگری ئەوە ئەوینتە ڕێ ڕێ ئەمسووتێنێ

کە ئاوی ئەوە زێتە دەمار ئەمخنکێنێ

11

تۆ جوانترین مەلەکوتی منی

تۆ کەون و کائیناتی منی

تۆ ئاخ تۆ چەند لە سەروی وجودی منی

12

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

تۆ چیت ؟ لە نووری یا لە تەمتومان

لە گیای

لە بای

یا لە قوڕی باخی جینان

لە بەفری یا لە بارانی

تۆ تەوتەمی

یا لە تۆوی پڕ لە بریقەی ئینسانی ؟



www.iqra.ahlamontada.com

13

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

تۆ شمشێری گۆرانییەکی خەمباری

بەسەر مەزاری دڵمەوە

تۆ تروسکێکی چەند دووری

بە سەر شەباقەی خوێنمەوە

14

دێمەوە لای تۆ، تۆ جەوهەری بوونی

دیمەوە لای تۆ ، تۆ کتێبی بروسکەو شەبەیخونی

15

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

ئەو شوێنانەی هەموویانم

بە قەفی زنجیر نووسیبوو

زەمەن هەمووی ڕەشکردنەوە

تازە چۆن ئەتوانم ووشە بکەم بە فەنەرو

دووبارە دایگیرسێنمەوە

چۆن ئەتوانم لە ناو چاوم ڕاتگرم و

بینایی خۆم بنووسمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

16

چەند درەنگ هاتی پیاتریس

ئەزانی من بەسەر لوتکەو لەبن هەموو بنارێکا

کتێب و شیعرو نیشانەی

دوا دیدارم بۆ دانابووی

لە ناو هەموو پەڵە گیایێ

قەڵەم و کاغەزی سپی و

مەرەکەبی خوێنم بۆ هێنابووی

ئەمویست بۆ دواجار ئەدگارت بنووسمەوە

کە نووسینەوەی ئەدگارت

تەنها کاری خوداکانە

17

چەند درەنگ داهات پیاتریس

هەر نەهاتی



www.iqra.ahlamontada.com

## له ستایشی جوانی تۆ

ئەوین تۆی، فیراق تۆی
نەخشین و نەخشان تۆی
پەخشین تۆی، پەخشان تۆی
نەوا تۆی، نەی هەر تۆی
نی تۆی، هەی تۆی
بەخشین و بەخشان تۆی
مەرجان و مەرج تۆی
حەقیقی و مەجاز تۆی
دڵی من سەرەندو، ئاقیق و دەقیق تۆی
باکوور تۆی، باشوور تۆی
تۆ شێوەو ناشێوەی
بازن و بازنە تۆی
سێ سوچ و سەد سووچ و گوناە تۆی
چوارگۆشەو سەدگۆشەو گاشە تۆی
خراپە تۆی، باشە تۆی
ئەوەندەی تۆ دڵمت بە تەیمانی فیراق تەنیوە



www.iqra.ahlamontada.com

ئەوەندەی تۆ چەقۆی ئەوینت لە سینەم چەقیوە
نە مانی بەفرشەو نە تەمبور بە تەلیا
ناسۆری ئاوەهای ژەنیوە
تۆ ڕۆژو ڕۆژگاری
بازنە و پەڕگاری
تۆ دیارو نادیاری
تۆ ناخ و ئەدگاری
شەم هەر تۆی، شەمزین تۆی
بەش بەش تۆی، هەموو تۆی
هەینی تۆی شەموو تۆی
تۆ سات و هەم سەدەی
ئەوینم ئەدەیتێ و تەمەنم لێ ئەبەی
تۆ ئەبی هەم دەدەی
تۆ یارو یاوەری
جەللادو داوەری
خەنیم و نەیار تۆی
ڕێی ئاڵۆزو سەختی ڕەوەز تۆی
دەشتایی و بەیار تۆی
گومان تۆی لە ئاسۆی ئەوینم
یەقین تۆی وەك گوڵ سوور ئەچییەوە لە شەوبۆی برینم



www.iqra.ahlamontada.com

سەنگین تۆی سوکین تۆی، بێهۆش تۆی، هۆشن تۆی
سامالْ تۆی، هەورین تۆی
سارێژ تۆی، برین تۆی
حەشیشەو بەنگین تۆی
ڕامان تۆی، ڕامین تۆی
لەرێی سەخت و لێژم هەورازو نشێو تۆی
لە نێو بەختی ڕەش و ئەبەنووسی منا، کافورو سپی تۆی
تۆ ڕم و ڕمبازی
تۆ هەم ساز هەم بازی
کەمەندو هەم کەمەند هاوێژی
ساقی تۆی، مەستی تۆی
مەیخانەو جامیش تۆی
شەراب و شامیش تۆی
جۆگەلەی کەوسەرو ڕووبارو زوقمیش تۆی
خالیق و مەخلوق تۆی
فریشتەو هەرماس تۆی
بوون و بوونەوەر، عەدەم و نەبوون تۆی
تۆ سەراپای فەزاو سەدیمی
تا ئەوینی پڕم داڕێژم
کتێبی ئێستاکەو قەلەمی ئایندەو دەسنووسی قەدیمی



www.iqra.ahlamontada.com

شەونمی سەرگیاو خوناوەی سپێدەی
ڕوناکیی و تاریکیی
بەرزی تۆی ، نزمی تۆی
لەفەرشی زەویدا شیرازەو تان و پۆی
له بێ جولەی ئاسمان هاوارو هات و چۆی
گریان و پێکەنین تەنها تۆی
شایی تۆی، ماتەم تۆی
تۆ مان و نەمانی
تۆ بەشێك لەخوداو پارچەیێ شەیتانی
سوڵتان و گەدا تۆی
مەرهەم و برین تۆی
بینین و بیستن تۆی
ئەوەی من له تۆ دیم
ئەوینم ساو ئەدا زمانم بە ئەستەم گۆئەکاو
پێم ئەڵێ کە کەون و کائینات ئەتۆبی
کەوابێ ئەمن چیم؟
ئەوەندەی تۆ دڵمت بە تەیمانی فیراق تەنیوە
ئەوەندەی تۆ چەقۆی ئەوینت له سینەم چەقیوە
نه مانی بەفرشەو نه تەمبور به تەلیا
ناسۆری ئاوەهای ژەنیوە



www.iqra.ahlamontada.com

## داركهێل

## بالكۆنێ بە سەر دەریاوە

لە بالكۆنی ریستورانتەكەی داركهیلدا وەستام
نەورەسێ لە دەریاوە هات
باڵەكانی بۆنی كەفی هەزار ساڵەی شەپۆلەكانی
لێئەهات
لەبەرامبەرما هەڵكورما، سەیری هەردوو چاوەكانی
ئەكردم
وەك بڵێی ناسیاوم بێت، یا خزمێكی نزیكی خۆی
دیبێتەوە
بۆ چەند دەقیقەیێ مایەوە
بەڵام من هەزار ساڵ لە ناو جوانییەكانی ئەوا مردم
دڵی پڕ كردم لە ئەوین ،
چاوی پڕ كردم لە ڕەنگ، ڕۆحی پڕ كردم لە ڕاوك
لە چاو تروكانێكا لە شەققەی باڵیدا فڕی
پانتایی دەریا خەمبارەكەی ناو دڵی ئەستەمبۆڵی،
بە تیغی باڵەكانی بڕی
بۆ ئەبەد تەنهای كردم



www.iqra.ahlamontada.com

## کەسێك لە بێزاری

لە تەنگەی پڕ ئەفسوونی بوسفۆردا
بە سەر پارچەیێ لە لیم
لە تەك باڵی سپی نەوڕەسەکان و
شریخەی بێ ئامانی شەپۆل ڕاکشابوو
هزری لەتلەتی لەو سەری دەریا بوو
جارجار دەستێکی ئەوەشاند،
تەمی بێزاری لە خۆی پاس ئەکرد
ئەتگووت مەلێکی خەمگینە، بە باڵەکانی ژیان ئەڕەتێنێ
بەڵام ئەفسووس ئەم بێزارییە وەك قیرِ بە دڵی نووساوە
کوپەی دڵی لە ناو ژەنگی ئەبەدییەتدا شکاوە



www.iqra.ahlamontada.com

## گەڕان لە دووی دەریا

حەز ئەکەم وەك نەوڕەسەکان
لە ناو لەپی دەریادا بوەستم، بەڵام ناتوانم
نەتوانینی من تەوقی وجوودە لە هەوکی کردووم
حەز ئەکەم وەك نوور، وەكترووسکەی سپی بەللور
بچمە قووڵایی هاواری دەریا، بەڵام ناتوانم
نەتوانینی من گەڤی وجوودە هەترەشی بردووم
من بە دوای دەنگی ئەو زەریاوانەم
لە رۆحی دەریا لە من ون بووە
ئەم ونبوونەیە شەوقی وجوودی لە من بڕیوە
بۆیە تا هەتا قەدەرم وایە
بسووڕێمەوە بە ناو فەلەکی ئا ئەم دەریایە



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەنادول کاڤێ

بەسەر قەڵا دێرینەکەی ئەنەدۆل کاڤێ هاوارم کرد
قەدەری نەورەس تەنها فڕینە بە سەر دەریاوە
ئەگەر چی نەوڕەس بەرزیش بێتەوە
بەڵام هەمیشە دوو چاوی گەشی هەر لای دەریایە
رێك وەك قەدەری تفت وتاڵی من
کەوا هەمیشە دوو چاوی ڕەشی
هەر لای وڵاتی بەبێ ئاڵایە

## شەرابگای بۆسنیا

خواردمانەوە خواردمانەوە
بەڵام گەیشتین مەحاڵ بوو
ئەوان خێرا خێرا ڕێگەیان ئەبڕی
خێرا خێرا پەیمانەیا پر ئەکردەوە
ئێمەش پێك پێك
ئەوان مەبەستیان گەیشتن بوو
بەڵام ئێمە گەیشتن وێرانی کردین
ئەوان مەبەستیان ژیان بوو
بەڵام ئێمە بەردەوام ژیان ئەیکوشتین



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەو

تۆم هەبوو ئەو کاتەی تۆم هەبوو
ئێستاکە وەك نەبووی
تۆم نەبوو ئەو کاتەی تۆم نەبو
ئێستاکە وەك هەبووی
لە میانی هەبوون و نەبوونی تۆدا
کرمی وەڕەسی درەختی وجوود کلۆر ئەکات
شەبەیخوونی بێ ئارامی
سەر بە زیندوومان شۆڕ ئەکات

## بیوك ئەدە

لە بیوك ئەدە دەنك و سەدا دراوێکی دەگمەنن
کپی، زەوی بە زنجیری ئارمووش کەلەپچە کردووە
دەریا باڵی نەوڕەسەکانی لە کەفی سپی گرتووە
باڕەکان گلاس گلاس شەرابی کپی ئەبەشنەوە
من خۆم قاپ قاپ کپیم ئەخواردەوە
لە بیوك ئەدە کپی سەرمەشقە بۆ گیان
بەڵام ئاخ دڵی من تژی بوو لە ژاوەژاوی ژیان



www.iqra.ahlamontada.com

## نەناسیاوێك

تەنهاترین تەنها بیر لە تەنهاییەکانی خۆی ئەکاتەوە
بەسەر کورسییەکی دارین دانیشتووە
یاری بە دەنکە زەیتوونەکان ئەکات
هاوڕێکەشی لە دەرەوە لەبەر باران پایپ هەڵدەقۆڕێنێ
ئەویش تەنها تەنهاترین تەنها
شوێنی خۆی لە ناو زەماندا
ئاوی خۆی لە ناو زماندا
بە یەنی ڕاکی هەڵدەسەنگێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

## کام قاپ؟

که به پەیژەکانی کومکاب  شۆڕ بوومەوە
شەوقی پەنجەرە بەرزەکان و تەنیایی ناو ژوورەکان
وەك بەلەمێکی شکاو
لە ناو ئاوی کپیدا وەستا بوون
کە گەیشتینە ناو دڵی کومکاب
پەیمانە شاهی شەقام بوو
مەی بە سەر پشتی بادا لە دەریاوە ئەهات
سەما وەکو هەڵم لە جەستەی مەستەکان هەڵئەسا
هەموو دەرگاکانی ڕۆح کرابوونەوە
ژیان لە ناو کاسەی بلوورینی مەستیدا
قیامەتی لێ هەڵسا بوو
دواجار کە گەڕامەوە دارکهێل
لە ڕێگەدا بووم بە هاوڕێی سە گێکی وێڵ
هەر ئەو سەگەش بوو وەك فیرژیل
منی گەیاندەوە فیردەوس



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەستەنبۆڵ

شەقامەکانی شەڵاڵی وەهم و هاڵاوی شووشەیە
کچەکانی مەستی و پێکەنین
مێژووی کتێبێکە قەڵغان و شمشێر
جوگرافیای شەبەنگێکە هەزاران رەنگ
ناو دڵیشی هەوری نێو زەنگ

ئەستەنبۆڵ 2015



www.iqra.ahlamontada.com

## خۆم

پیاسەیێ بۆ لای کۆنە مەحەتەکەی قیتار
سەرێ لە غاباتەکەی عەسکەری
گەڕان بە نێو کۆڵانە تەنگەکانی قەڵا
یا چوونە سینەما و دانیشتن لە چل باوی
سوحبەتێ لە گەڵ برادەران
گوێگرتن لە گۆرانی و گریان
یا مانەوە تا شەڵاڵ بوون لە بەر باران
بیرکردنەوە لە وجودو ئاسمانی شین
نووسینی شیعرو شیعر نووسین
داڕشتنی دەقی زیندوو
تووڕ هەڵدانی شیعری مردوو
هەمدیس شیعرو شیعری زیندوو



www.iqra.ahlamontada.com

## یۆتوپیا

کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان دوورتر
هەمیشە غەرقی تەم بووە
کۆڵانێ لە هەموو کۆلانەکان نزیکتر
هەمیشە بارانی لێ دەبارێ
کۆڵانێ لە پشتی هەموو کۆڵانەکانەوە
هەمیشە دەنگی گۆرانی لێ دێ
کۆڵانێ لە پێش هەمو کۆڵانەکانەوە
هەمیشە بەفرو زریانە
کۆڵانێ جوانتر لە هەموو کۆڵانەکان
پڕ لە باڕ و سینەمایە
کۆڵانێ پیرتر لە هەموو کۆڵانەکانەوە



www.iqra.ahlamontada.com

پڕ لە کتێب و چرایە
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان گەورەتر
پڕە لە پیاوی بچووك
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان بچووکتر
پڕە لە منالّی گەورە
کۆڵانێ لە هەمو کۆڵانەکان بەرزتر
ئاسمانی لەوێ یەکجار دوورە
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان نەویتر
ئاسمان لەوێ زۆر نزیکە
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان تەسکتر
دێوەکان بەوێ رەت دەبن
کۆڵانێ لە هەموو کۆڵانەکان فراوانت
جێی ئەوینی تیا نابێتەوە
کۆڵانێ لە هەمو کۆڵانەکان درێژتر
هەناسەی ئاشقەکانی کورتە
کۆڵانێ لە هەمو کۆڵانەکان کورتتر
سەدای شاعیرەکانی درێژ



www.iqra.ahlamontada.com

ئا لەو کۆڵانەدا بوو دڵم بزر بوو
ئێستاش ئەو کۆڵانە بەو دڵە دەژی
لەو کۆڵانەدا بوو فرمێسکم رژا
ئەو کۆڵانە لەو پرسەیە دەژی
لەو کۆڵانەدابوو ئەوینم بە سەر بەردی دڵی کچێکا پژا
کچە بوو بە داستان
بۆیە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو کۆڵانە
تا ئەو ماڵە بدۆزمەوە
تا ئەو فرمێسکانە کۆکەمەوە
کە لە ئەوینی ئەودا ڕشتم
تا دڵەکەم بدۆزمەوە
کە وەکو گۆزە لێم شکا
بەڵام ئاخ ئەو کۆڵانە لە هەموو شوێنێ دوورترە
کاستێلیایە



www.iqra.ahlamontada.com

## کۆکردنەوەی شەونم

من ئێستا تای ئەوین داگیری کرددوم
شەونمی رژاوی چاو کۆ ئەکەمەوەو
کیمیای دڵشکانی پێ ئەنووسمەوە
جانتاکەم پڕە لە فرشەی زەردهەڵگەڕاوی پاییز
پڕە لە وێنەی ڕووتی سپێدە،
لە پەلکە گیای مەینەتی
چوومەتە ناو ماڵی سکڵ
ڕێنووسی ئاسۆی پێداوم
قوڕی خەیاڵی مەحاڵم گرتۆتەوە لیرەو لەوێ
ئاخر نووسینەوەی تۆ زمانی تابانی پێئەوێ
کردنەوەی دوگمەی ئاوین و
زریزەی گەردنی وەهم
خوێندنەوەی کڵپەو بلێسەی ناو کتێبانی پێئەوێ
لێکدانەوەی شوفرەی نێوان
سپێدان و کزەبای ساردو
تۆزێ قەردی حیکمەتی
لە خەزنەی خودا پێئەوێ
پێشەکیم نووسیوە باران پێدا چۆتەوە گریاوە
تا لە سەرنجی ناو شیرازەکانی مانگ گەیشتووم



www.iqra.ahlamontada.com

سەدان تاشەبەرد شەق بووە،
سەدەفی دەریا هێناوە
تێکەڵی خوێنی وشەم کردووە
چوومەتە دوورترین قەڵا دێرینەکان
ڕەنگی ئاویم لە خشتەکان دەرهێناوە
مەرەکەبم لە خوێنی پەپوولە دزیوە
بۆیە هەر شتێ ئەنووسمەوە باڵ ئەگرێ
تا ناونیشانم داڕشتووە سەدان پەڕم دڕاندووە
لەگەڵ سەدان تیشکەنازی ئێوارەکان بەشەڕ هاتووم
ئاخر من ئەمەوێ مێژووی شەونم بنووسمەوە
هەزاران کووپەی شەرابم خەست کردووە
تا تۆزێ جوانی ناو مانام دەست کەوتووە
داڕشتنەوە لەبی شەونم پێویستی بە بای پاییزە
پێویستی بە سیحرو گومانە
داڕشتنەوەی خەمی شەونم پێویستی بە وەهمی زمانە
ئاوازی ناو قوڕگی شێرم دەرهێناوە
دێوەزمەی شەوم کوشتووە
لە ئەلیژیریا قسەم لەگەڵ ئۆدیسای دانتی کردووە
چوومەتە ناو گەلەرییە دێرینەکانی فینیس
نووسینی سەر هەزارەها تاشە بەردم خوێندۆتەوە
بە ئاوی حەوت پشتی شەونم وێنەی بەرگم داڕشتووە



www.iqra.ahlamontada.com

ئاگرم لە پرۆمیتۆس دزیوە
خشتی زێڕی دیدگام دارِشتۆتەوە
من ئەمەوێ مێژووی شەونم بۆلکە گیا بنووسمەوە
من ئێستا لە نێو خەرەندی یادەوەری
کەڤری وشەکان ئەشکێنم
تا شووشەی شکاوی شەونم کۆکەمەوە
هەموو سپێدەیەك لەبەر بای کێوان ئەوەستم
تا شەوقی ئەزەل دەسگیر کەم
دواجار گریام زۆر گریام
فرمێسك و شەونم تێکەل بوون
لە گۆڕستانە کۆنەکە پاڵتۆ تازەکەی خۆمم
بە کێلی گۆڕێ هەڵواسی
جەستەی خۆمم لە ناو دڵی تاشە بەردێ ناشت
کە پڕ بوو لە گوللەی گەرمی یادەوەری
ئێستاش کە خۆرەتاوی ئێواران لێی ئەدا
وەك زیو ئەبریسکێتەوە
پیاوێکی پیر بە کوڵنگێکی تازە
هەناوی زەوی شەق ئەکرد بە شەنم ئەیڕشاند
بالۆرەی بۆ گەنجێتی خۆی ئەچڕی



www.iqra.ahlamontada.com

سەرم کووللەی بەفرەو دڵم ئاگر
کۆتەرە درەختێکی لار سێبەری دابووە گۆڕێکی ڕاست
شەرمێکی کچانە گەڵاکانی ئەبەخشی بە پاییز
من هەر لە گۆڕستانەکە مامەوە
چوزانم هەزار ساڵ ئەبوو
ئاخر من مێژووی شەونم ئەنووسمەوە
لە هەموو لایەکەوە خەڵك تەرمیان بە دیاری ئەهێنا
خاکیش دەروونی خۆی ئەکردوە گۆرانی ئەووت
وەرنەوە ناو باوەشی من جگەرگۆشەکانم
هەموو ئەوانە ئەوکاتە رووی دا کە ئێوارە باڵی شکابوو
من وامزانی سپێدەیە  هەر زوو شەوم بەسەرداهات
شەوێکی درێژوو ئەبەدی  غەرقی شەونم بوو بووم



www.iqra.ahlamontada.com

## کاڵبوونەوەی ڕەنگەکان

من چەند سەیرم، هەتا ئێستاش فەنەرەکانی منداڵیم
لە ناو زەینم هەڵگرتووەو فڕێم نەداون
هەتا ئێستاش لە گەڵ خۆما ئەیانگێڕم
وا ئەزانم منداڵەکەی جارانم و ئاسمان کڵاوی زەوییە
هەتا ئێستاش ئەچمەوە سەر گردەکەی جاران
بەڵکو لەوێوە دەستم لە ئاسۆ گیر ببێ
دەمم پڕ عەسەلی بکات
یاشەوان جارجارە، بەپەلە ئەچمەوە سەر بان
بەڵکو دەستم بگاتە ئاسمان
هێشوو ترێی ئەستێرەکان بڕنم
بەپێ پەتی بەناو ژیان کەوتووم



www.iqra.ahlamontada.com

ژیانیش بێ ڕەحمانە هەوێردەی ڕۆحم ئەکوژێ
هەست بەوە ناکەم کە ئێستا گەورە بوویمەو
سێ چوار منداڵ و یەکدوو هەزار کتێب و
ملیۆنێ قاسەی خەمم هەیە
ئای من کەسێکی چەند سەیرم ؟
دوێنێ چوومەوە گەڕەکی منداڵی
بە دڵێکی شکاو و بەچاوانی فرمێسکەوە
هەموو شتەکانی منداڵیم دوور فڕێدا دوور دوور
ئێستاش دوای ئەو کارەساتە ژیان چەند بێ تامە
بیرکردنەوەم چەند بێ مانایە
نە ئاسۆ ماوە نە ئەستێرە،نە خەونم وەکو جارانە
ماڵاوا ئەی منداڵییە بەدبەختەکەم، خۆشییەکانم تەواو
دوای تۆ هەموو شتێ وێرانە



www.iqra.ahlamontada.com

## داڕشتنەوەی جوانییەکان

قەدە گیایێ ئەنووسمەوە
ئاواز لە بەرد دابتاشێ و نەمری ببەشێتەوە
ڕستێ شەبەنگ ئەچنمەوە
مانای ئەبەدی داڕێژی و
ئاوی حەیات داگیرسێنێ
گومانێکم لە تاسەی ئەوین چڕیوە
دەنگ لە تاشە هەڵئەسێنێ و ئەدگارم ئەنووسێتەوە
تەوارێك لە مەستی جوانیت نەنەخشێنم
بۆ ئەوەی جارێ پێکەنم
ئەبێ هەزاران جار بگریم
من کە وشە ئەکەم بە بەری نادیاریی
تا جوانیی دابڕێژم
ئەبێ پەیکەری هەزاران بتی شیعر
لەناو زەین وردوخاش کەم
تا مۆمی خوێن داگیرسێنم
بەناو ڕێگەو بانەکاندا تێپەڕیوم
تاجی شکاوی هەزاران پاشاو میرم شکاندووە
شەرابی مەرگم نۆشیوە و لە کوپەکانی گریکدا
قوم قوم ئاوم خوادۆتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

لە گەڵ رۆحی ئەنكیدۆ دا
زێڕوزیوی یادەوەریم لە دارستان شاردۆتەوە
گوێم لە دڵی خاك گرتووە
چۆن لە ژێر پێی ئێمە ئەگری
بە سەر ئەو ئێوارانەوە ماومەتەوە
زمانی تیشك ئەزانن
بە ناو بەندەنی سكڵدا بە پێ پەتی ڕامكردووە
تا ڕێژنەیێ جاویدانیم بە سەر شان و مل باریوە
دەرەوشانەوەی بێدەنگیم
لەو تاریكە شەوانەوە دەستكەوتووە
كە ئەندێشەیان وەك عەتر
لە شووشەی  قەدەر كردووە
ڕووناهییان لە ناو چاوی من هاڕیوە
باقە گیایێ ئەنووسمەوە
لە فیراقی شەونمی خۆیا سیس بووبێ
قاسەی شیعرێ ئەكەمەوە
نووری جوانی لێ بڕژێت و دونیا نوقمی هەتاو بكا
كە ئەمەوێ كتێبی تۆ بنووسمەوە
ئەبێ ڕووناكی ڕاو بكەم
دەسەڵات لە خوا بسەنم



www.iqra.ahlamontada.com

خوایەتی خۆم ڕەچاو بکەم
لە گۆڕستانە کۆنەکە پاڵتۆ تازەکەی خۆمم
بە کێلی گۆڕێ هەڵواسی
جەستەی خۆمم لە ناو دڵی تاشە بەردێ ناشت
کە پڕ بوو لە گوللەی گەرمی یادەوەری
ئێستاش کە خۆرەتاوی ئێواران لێی ئەدا
وەك زیو ئەبریسکێتەوە
پیاوێکی پیر بە کوڵنگێکی تازە
هەناوی زەوی شەق ئەکرد
بالۆرەی بۆ گەنجێتی خۆی ئەچڕی
سەرم کووللەی بەفرەو دڵم ئاگر
کۆتەرە درەختێکی لار سێبەری دابووە گۆڕێکی ڕاست
شەرمێکی کچانە گەڵاکانی ئەبەخشی بە پاییز
من هەر لە گۆڕستانەکە مامەوە



www.iqra.ahlamontada.com

چوزانم هەزار ساڵ ئەبوو
لە هەموو لایەکەوە خەڵك تەرمیان بە دیاری ئەهێنا
خاکیش دەروونی خۆی ئەکردوە گۆرانی ئەووت
وەرنەوە ناو باوەشی من جگەرگۆشەکانم
هەموو ئەوانە ئەوکاتە روویدا
کە ئیوارە باڵی شکابوو
من وامزانی سپێدەیە
هەر زوو شەوم بەسەرداهات
شەوێکی درێژوو ئەبەدی
غەرقی شەونم بوو بووم



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەوە تۆی

تۆ لەهەر کوچەو کەنارێ عاشقێکت
بە شاپەڕی باڵەکانت  دیلکردووە
لەهەر باخ و دارستانێ
مەلێکت بە ئاوازی شەرابی سوور مەست کردووە
بۆهەر شارێکەوە چووبیت
دڵێکی شکاوت جێهێشتووە
تۆ ڕەونەقێکی ئەبەدیت
بەهەر  ڕێگەو ڕێگاستانێ تێپەڕبووبیت
بە هێمای پڕ لە ئەفیونت
ڕێبوارێکت مەست کردووە



www.iqra.ahlamontada.com

## سیزیف بۆ تەنها جێتهێشتم؟

بەردێك بووم بێ هەست و بێ خوێن
لە دوورترین بناری بیمانایی ژیان
سیزیف وازت لێ نەهێنام
هەتا مانای هەموو بوونت لەسەر ناوم کۆکردەوە
بەردێك بووم تەنهاترین بەرد
باران ئەهات ئەیشووشتمەوە
نەبووم بە ئاوێنەی هەتاو
زریان ئەهات دڵی فێنك ئەکردمەوە
سیزیف هەر وازت نەهێنا
بەردێك بووم لەپەنایەکی دووری دونیا
ماندووەکان ئەهاتن لە سێبەرما پشوویان ئەدا
سیزیف هەر وازت نەهێنا
تابووم بەرەمزی سەرزاران
هەموو ڕۆژێ منت ئەگەیاندە لوتکەو



www.iqra.ahlamontada.com

لەوێ گلۆرت ئەکردمەوە
سیزیف هەر وازت نەهێنا
ئێستیایش وا لەناو ئەم دۆڵانە
دەنگم سەدا ئەداتەوە
گەر دۆستم بای وا ئێسقانت نەئەشکانم
سیزیف بۆ وازت نەهێنا
لەم هات و چۆیەت ڕاهێنام
لە قووڵایی زەمەن کەوتووم
کێ ئەمباتەوە بۆ لوتکە
هەمدیس گلۆرم کاتەوە؟
ئای کە ئێستاکە بێ مانام



www.iqra.ahlamontada.com

## دوور دوور تا حەبەشە

ئەو کاتەی سواری سەرپشتی بایەکان بووم
فێر بووم بچمە ماڵی درەختەکان و
گەڵا گەڵا بیاندوێنم
فێر بووم لە پرسەىمەرگی تاریکی دانیشم
رووناکی ئاوم بۆ بێنێ
ئێستا ئەزانم لە فێبرایەر
رێم ئەکەوێتە لای شەراب فرۆشە خەمگینەکەو
سەدان بوتل گریانی خۆیم پێ نۆش ئەکات
ئەچمەوە لای خۆشەویستەکەم
بە دەستەکانی هێما بۆ تاتۆی سەر سینەی ئەکات
لە دوورەوە بە هێمای چاوی
پێم ئەڵێت هەی مخەننەت
کە چوومە ناو رۆژە دژوارەکانی
شەپۆل فێری ئەوە بووم
چۆن ماڵم لە ناو دەمی حووتەکان دابنێم
کە ئەگەیشتمەوە کەنارەکان  چۆن لە گەڵ
کچە جوانەکانی پەنگوین
بچم بۆ ناو مانگی هەنگوین
لە گەڵ سفووری ژێر میترۆکان



www.iqra.ahlamontada.com

سەرم بە سەر رانی ئەفرۆدێت کردووە
حەشیشم خواردووە
لە بارەکانی حەبەشە لەگەڵ رامبۆ دانیشتووم و
فشەمان بە شیعر کردووە
لە گەڵ دونکیشۆت چوومەتە شمشێربازی
هەزاران هەزار خەیاڵم کوشتووە
بە سواری قیتار چوومەتە روسیا و
هەزاران رستەو چەند رۆبلێکم
لە سەر مێزی قوومار
لە دایستوفیسکی قەرد کردووە
لەبەرزەکدا بانگی دانتیم کردووە
پێم گوتووە چەندین جار لە سەر رووباری ئارنۆ
شەرابی سیزانۆمان پێکەوە خواردۆتەوە
لەگەڵ خۆت بمبە بۆ بەهەشت
لە هەرێمی لیمبۆدا رزگارم کە من ئاوەمۆر کراوم
لە جیکۆر چوومەتە ماڵەکەی سیاب
لە باتی ژەمێکی خۆش
یەکدوو کتێبی سپی شیعرو
کاسێتێکی بول رۆبسنی پێ بە خشیوم



www.iqra.ahlamontada.com

## پاسی ژیان

تا ئەهات دووری ئەخستمەوە

ڕابردووشم وەك ئاسكی سپی

تا ئەهات لە چاو ئەترازا

دواجار جگە لە تارمایی

شتێ لەبەر چاوم نەما

زانیم پاسەكە

دوا وێستگەی تەمەنی بڕیوم

ئیدی منی بۆ ئەبەد

لە زیندوێتی كڕیوم



www.iqra.ahlamontada.com

**بەسەر** لقی درەختی حیکمەتەوە
وەك زیوی سپی چرۆی دەرئەکرد
وەك یاقووتی شین ئەدرەوشایەوە
کە وادەی هات و گوڵی پەڕی گرت
وەك ساوی ماهووت ئەگەشایەوە
کاتێ گەیشتە دوا لوتکەی ڕسکان
کەوتە خوارەوەو تەلان لوولی دا
بۆ تەمتوومان و سیسبوون و پیریی
ئەوساکە زانی ئەویش بۆ ئەبەد
کەوتۆتە داوی ناو گۆشەگیری



www.iqra.ahlamontada.com

**ڕەش** بوو ڕەش ئەو ئاگرە
توورەیی شاخێ بوو
ڕەش بوو ڕەش ئەو ئاگرە
خەمباری باخێ بوو
ڕەش بوو ڕەش ئەو ئاگرە
سێدارەی ناخێ بوو
ڕەش بوو ڕەش ئەو ئاگرە
وەك هەوری سەرچەم و دۆڵەكانی
ڕەش بوو ڕەش ئەو ئاگرە
توورەیی نیشتیمانم بوو
لە ناپاكی ڕۆڵەكانی



www.iqra.ahlamontada.com

**هاوڕێکەم** نوکتە ئەگێڕێتەوەو پێئەکەنین
گۆرانی ئەڵێ و ئەگرین
هاوڕێکەم ئێستا گۆچانێکی هەڵگرتووە
جار جارە سەری ئەسووڕێ
کتێبەکەی تووڕ هەڵئەدا
جگەرەیێ دائەگیرسێنێ
هەناسەیێ ساردی
وەك بەفر بە با ئەدا



www.iqra.ahlamontada.com

**ویستم** بەرز ببمەوە کەوتم
خۆم لە تەك کوپەیێ شەراب بینییەوە
پەیمانەم بینی بەسەر دەم ڕاکشابوو
پەیمانەی سپی مینا تەمتوومان
پەیمانەکانم پڕ کردن لە شەراب
شەرابەکەم خواردەوە
کەوتم بەڵام گەیشتمە ئاسمان
ویستم بکەوم بەرز بوومەوە
سەرم دای لە مانگ
وامزانی بەرەو فەنا ئەچمەوە
مانگ شکا بوو بە ئاوێنە
ئاوێنەم هەڵگرت
خستمە ناو باخی سپیی کتێبخانە
کتێب بوو بە نوور
ئێستاش بەو نوورە
هەروا ئەفڕم و بەرز ئەبمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**کوردەکەم** سیزیفەکەم
ئەمجارەش وەك جاران
بەردەکەت
کە بە خوێنی شانت سوور بووە
بە دەستی خاراوت لووس بووە
گەیاندە ترۆپك و هەمدیسان
گلۆریان کردەوە بناران



www.iqra.ahlamontada.com

**هەموویان** لەبەریا هەستانەوە
کەسێ تەنها وەستا بوو
سەیری خۆرەتاوی ئەکرد
تەنها ئەو دانیشتەوە
تێگەیشتم هەندێ دانیشتنەوە هەن
هەموو هەڵسانەوەکان ئەکوژێت



www.iqra.ahlamontada.com

**پیاوە** پیرەکە

خەون بە زەمانی گەنجێتییەوە ئەبینێ

گۆچانەکەی فڕێ ئەدا

عەینەگەکەی ئەشکێنێ

وەرزش ئەکا سەراوسەر بۆناو ئاو باز ئەدا

لە بنی ئاوەکەوە بیری دێتەوە

ئەو پیرەو گەنج نییە

لە ژێر ئاوەکە نایەتە دەرەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**چەند** وەستام
لە ئاستانەی سپی سیماتا نەهاتی
چەند سووتام
لە کانوونی گەرمی نیگاتا نەهاتی
ئەی شووشەی ئەو دڵە شکاوەم
چەند بە دوات لەت لەت بووم نەهاتی
ئەوێستاش لە تاقی ئاسماندا
وەکو خۆر هەڵاتی
بووم بە خۆڵەمێشی بەر بارانی ئەبەد
دەبینی نەهاتی و نەهاتی و نەهاتی
ئەی تەونی چلچراو نەخشی خوێن
ئەی شەوقی پڕ لە نەزم و بەزم و بێن
ئەی تاوێ لە بارانی توورە
دڵ هات و سووڕاوە بوو بە تەم
تەم هەموو گڕی گرت
تەمتوومان ڕەوییەوە
نەهاتی



www.iqra.ahlamontada.com

**زۆرجار** قەڵەم لە ناو تەمتوومانی وشە
گیر ئەبێت و ڕۆحی ئەبێتە خۆڵەپۆك
هەندێ جاریش
لە ناو وەردی پڕ لە چەمکی وشەکاندا
مەست ئەبێت و
بۆ پەریسای دێرە شعرێکی ئەبەدی
دێتە سەر چۆك
زۆرجار قەڵەم ئەکوژێتەوەو دانایسێ
لە ناو کوانووی ماناکاندا
بە هیچ تەلەزمە ئاگرێ داناگیرسێ
بۆ گەیشتن بە باخی پڕ گەڵای مانا
تۆ ڕووناکی هەڵئەکەنی
ئەبێ هەتا ماوی بگری
تا بۆ جارێ پێبکەنی
ئەی قەڵەم
ئەی تریفە ڕێژی جاویدان



www.iqra.ahlamontada.com

**هەموو** ڕەنگەکانت گرتووە
هەر ئەڵێی شاڕەنگ و شەبەنگی
هەم شوێنی و هەم کاتی
وەك ئەوەی فەلەك هەڵسووڕێنی
هەموو ئاوەکان لە سیماتا هەڵئەڕژێن
هەر ئەڵێی زەریا لە ڕۆحتایە
هەم بازی و هەم قەفەز
وەك ئەوەی هەبوونم لە دەستی تۆدابێ
جارێ لە فڕینی و
ئاسمانم پڕ ورشەی باڵ ئەکەی
جارێکیش سەراپای کیانم
لە قەفەس بەند ئەکەی
هەم شەرابی سپی کەوناری و هەم ساقی
جارێ جامی گەشی پەیمانەم
لێ وردوخاش ئەکەی
جارێکیش بۆ ئەبەد
سەری پڕ لە شیعرم مەست ئەکەی
لەززەتی ئەشقی من هەر ئاوا نەمرە
کە تۆ هەم یەقین بی و هەم گومان
منیش بەندۆلێکی تا هەتا سەرگەردان



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەگەرچی** بای چاخی سەهۆڵ
وەکو پووشێ ئەمهێنێت و ئەمڕفێنێ
شەپۆل لە دەریای بێوچان
وەك قایغێکی سەرگەردان ئەمسووڕێنێ
زریانی چلەی ڕەوەزان
مووخی سپی ناو ئێسقانم ئەسووتێنێ
بەڵام ئەوەی گەرمی ئەبەخشێ بە خوێنم
تەنها شیعرە
شەوقی مەلی ئازاد بوونە
لەناو بێشکەی جاویدانی ڕامئەژێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

**واهەست** ئەکەم

پەرداخێ شەرابی سووری

لەناو تاقی پەنجەرەیێ

کەپڕ هەتاوی زێڕ بووە

ئەندێشەی پڕ ئاگر کردووم

هێندە سورفڵ هەڵگەڕاوە

ئەڵێی خۆخێکی شەرمنە

تازە شیری تیا پژاوە



www.iqra.ahlamontada.com

من نەغمەیەکی کورتم
تۆش ڕێگەیەکی درێژ
ئەو نەغمە بەشی تۆ ناکات
من ریژنە بارانێکی لەسەرخۆم
تۆش ڕێبوارێکی خێرا
ئەو ڕێژنەیە بەشی تۆناکا
من گۆرانییەکی خەمگین و
تۆش سەمایەکی خێرا
من ژێی گیتارێکی شکاو
تۆش ئاوازێکی زیندوو



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆ** وەك قەرەجێکی سپی
پەیتوونەکەت جووتێ سووسکە ڕایئەکێشێ
هەگبەت پڕە لە نانە قەیسی
دڵیشت پڕە لە ئیشق
کەی ئەگەیتە ماڵەکەی من
کە جۆلانەم لە شاتو دروست کردووە
لیوانم لە شەرابی سوور بۆ پڕ کردی
تۆ تەوتەمێکی چەند جوانی
لە کانی تەمتوومان ئاوەمۆر کراوی
شەوقت هێندە بەرز ئەبڕێ
ئەڵێی کاسەیێ هەتاوی



www.iqra.ahlamontada.com

**شەوێ من** و ئاو بەتەنها ماینەوە
ئاگری نهێنی وجود دایگرتین
شەو خۆی و هاژەی ڕووباری
ڕووبار خۆی و لمی کەناری
کەنار خۆی و بەستەی شەپۆل
شەپۆل خۆی و تارمایی ڕاوچی
ڕاوچی خۆی و گیانی ماسی
ماسی خۆی و تەڵەسمی تۆڕ
منیش خۆم و بەلەمەکەم
لەناکاو جەستەی نەوڕەسێ داگیرسا
قەڵەمی دڵم ئاگری گرت
وەك زەیتی خودا داگیرسا



www.iqra.ahlamontada.com

**رامبۆ** بە تیغی ساودراوی زمانی
بە هەردوو قاچە لاوازو ماندووەکانی
گیای دامێنی زۆنزای
لە ژێر قاچەکانی پلیشاندەوە و
هاواری کرد، هاوارێکی ئاگرین
ئەی گیاکان
من هەرگیز شیعر بۆ ئێوە نانووسم
قاچەکانی بۆن و بەرامەی گیایان هەڵنەمژت
لە میان چیاکانی باڤیلادا هەڵوەرین
تۆ لەبارەی گیات نەنووسی رامبۆ
بەڵام گیا تا ئەبەد شین ئەبێ رامبۆ
بە ئومێدی ئەوە مەبە گیاکان شین نەبنەوە
قاچەکانت بە پەتای جوزام هەڵوەرین
بەڵام هەموو ساڵێ بەهار دێ و
گیاکان لە کەناری مۆزێل شین ئەبنەوە

-----

زۆنزا : چیای زۆنزا لە فەرەنسا
باڤیلا : چیای باڤیلا لە فەرەنسا
مۆزێل : رووباری موزێل لە فەرەنسا
رامبۆ شاعیرێکی فەرەنسی بوو ،
بە نەخۆشی قاچەکانی کۆچی دوایی کردووە.



www.iqra.ahlamontada.com

**کەڵا** گەشەکانی درەختی ڕۆحم سیس هەڵگەڕان
لاپەڕە سپییەکانی زمانم ڕەش بوونەوە
لوتکەکانم بوون بە بنار
داگیرسانم کوژایەوە
رۆناهیم بوو بە تاریکی
نزیکییەکانم کەوتە ناو دڵی دووری
خۆشییەکانم بوونە کۆست
ئایندەم بوو بە ڕابردوو
ئەترسم هەبوونم ببێ بە نەبوون
تۆش
هەر فریام نەکەوتی ئەی دۆست



www.iqra.ahlamontada.com

**بڕیار** ئەدەم هەستەکانم کلیل بدەم
تۆش هەمیشە کلیلەکانم ئەشکێنی
بۆیە مەحاڵە تۆلە زەینم ڕەش ببیەوە
بڕیار ئەدەم دەرگای دڵم کلیل بدەم
تۆش هەمیشە کلیلەکانم ئەشکێنێ
بۆیە مەحاڵە تۆ ناو دڵی من جێ بهێڵی
بڕیار ئەدەم هەردوو چاوم کلیل بدەم
تۆش هەمیشە کلیلەکانم ئەشکێنی
بۆیە مەحاڵە کەوا من دونیا بە چاو ببینم
بڕیار ئەدەم نەوای ڕۆحم کلیل بدەم
تۆش هەمیشە کلیلەکانم ئەشکێنی



www.iqra.ahlamontada.com

**خۆم** لە حیکمەتی کتێب شاردەوە

کرمی ماتەمی خواردمی

خۆم لە شەوقی ئەوین شاردەوە

لەهێی نیگەرانی بردمی

کە خۆم لە ژیان شاردەوە

شەوتای نیگەرانی ئەبەدی

بۆلای مەرگ و مووش ناردمی



www.iqra.ahlamontada.com

**که** ڕەشەبا ئاگری گرت
دڵی پاکی زەوی سووتا
نیگەرانی وەکو ماهووت
فەزای ئێمەی دائەپۆشی
دونیا هەموو بوو بە تابووت
بەڵام کە تۆ بە ئاوێنەی شەختەی سپی
زمانت بەخشی بە چلوورەی مەحاڵ
بێ پەروا یاریت بە ئاوی سەما ئەکرد
دونیا هەموو بوو بە نارنج و پرتەقاڵ



www.iqra.ahlamontada.com

هێندێ مەرجانی ڕۆحی خۆم
لەناو باخی کتێبەکان
هێندێ وشەی زۆر ناوازەم
لە بەندەری فەرهەنگەکان کۆکردەوە
هێندێ تیشکی جاویدانیم
لە کەلێنی ئەشکەوتەکان
هێندێ ئاوازی زۆر خۆشم
لەناو گەرووی باخەکاندا کۆکردەوە
هەموویانم تێکەڵ بە جەستەی شیعر کرد
کتێبخانەکەم پڕی ئەبەدییەت بوو



www.iqra.ahlamontada.com

**تێنووەمان** بوو ئاویش
لە ژێر تاشەبەردی ملەی چیا
ئاواز ئاواز ئەڕژایە نێو قەدی گیا
سەبەت سەبەت
ترێی عومری ئێمەی ئەڕنی
نە کتێب دادی ئەداین
نە حیکمەتیش
تینوێتی ئێمەی ئەچنی
دەنگی ئاو ئەهات و ڕەنگی نەبوو
لە ناو ئاوێنەی کەوندا
هەموو هەستێکمان مردبوو
هاوارمان کرد ئەی ئاو ئەی ئاو
ئاوی سەماو تەونی ڤیان
کەی ئەو کەڤرانە شەق ئەکەی
ئەماندەیتەوە دەست ژیان؟



www.iqra.ahlamontada.com

**کەی** دێی هەتا مەلت بنێرمە پێشوازی
داو داو تیشکت بۆ ڕابخەم
پونگی چیات بۆ بهۆنمەوە
مرواری ژێر دەریاکانت بۆ ڕاوبکەم ؟
کەنار کەنار
گەنمی سپی قەندەهارت بۆ ئەچێنم
زێ زێ ئاوت بۆ لەبەردی شاخ ئەهێنم
ڕێگات بۆ کورت ئەکەمەوە
تۆ ڕووبارو ڕووبار وەرە
هەر زوو ئەگەیتە ماڵی من
بەس تۆ وەرە
سامالْت بۆ ئەهێنمە خواری خوارەوە
لە ناو ئاونگی سپێدان غەرقت ئەکەم
سووڕی زەمەن ئەوەستێنم
تەختی ترست بۆ لەق ئەکەم
شەوگارت بۆ بە شەوقی شیعر شەق ئەکەم
بەس تۆ وەرە



www.iqra.ahlamontada.com

ئەمەوێ بنووسم، بەڵام چی بنووسم ؟
هەموو شتەکان نووسراون
ئەمەوێ بچمە باغەکان، بەڵام بۆ بچم ؟
مەلەکان هەموو کوژراون
ئەمەوێ بڕۆم، بەڵام بۆ کوێ ؟
شوێنەکان تەلبەند کراون
ئەمەوێ هاوارکەم، بەڵام چۆن ؟
ئازادییەکان باڵکراون
ئازاری ئەبەدی هەمیشە لەسەر خوانە
لەگەڵ ئەوەش
ئەنووسم، ئەچم، ئەڕوم، هاوار ئەکەم
چونکە ژیان بە بێهوودەییەوە جوانە



www.iqra.ahlamontada.com

ﮐﻪ به ته‌ك ده‌راوی ئه‌به‌دی تۆدا رابردم
جگه له ئه‌دگاری سه‌وزت هیچم نه‌دی
مه‌زرای بیبه‌ری سه‌وزم بیرکه‌وته‌وه
که قل قل و هه‌زار هه‌زار خۆی ده‌نوێنێ
بچووك بچووك و شه‌رمن
نوقمت ئه‌که‌ن له جوانی
ئه‌ی دێرینترین مه‌زرای من



www.iqra.ahlamontada.com

**خۆشتر** لە فەریکی پڕشیری گوڵە گەنم
جوانتر لە کرمی ئاوریشم
من ڕەژووی وشە ئەکەم بە ئەڵماس
هەرگیز مۆرانە نایبڕێ
هیچ نەرگزێ ناپشکوێ
ڕەشەبا بەسەریا هەڵنەکا
کە بەسەر دڵم هەڵئەکا
ئەشق و ئەوین وەك شەستە بارانی بەهار
بەسەر شیعری من دائەکا
ئەڵماس مۆرانە نایبڕێ



www.iqra.ahlamontada.com

**زۆر** جارسەیری شیعرەکانی خۆم کردووە
وەك کۆمەڵە زەنگیانەیێ
ڕەنگی خۆریان هەڵمژتووە
بە ئاگا لەخۆبوونەوە
بە جلێکی ڕەونەقداری
دوورترین کوانووی گەردوونەوە
وەك ئەوەی لە قووڵایی
شەرمی ئینسانی ڕووبچن
بۆ بەردەمی خوێنەر ئەچوون



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەو** ڕۆژەی کە سپێدەی تۆ

وەك باوەشێ تیشکی بێ شوێن

نەگەڕایەوە هێلانەم

ژێی مانەوەم لە بن و بۆتکەوە پسا

فەلەك کەوتە ناو گۆمی خوێن

دڵ ترپەی خۆی لەبیر کردو

ئاگر گەرمایی پێنەما

مەل فڕینیان نەناسییەوە

گەڵای سەر درەختان سەما

هەرچیم بینی لەم کەونەدا

ڕەش هەڵگەڕا



www.iqra.ahlamontada.com

لەسەر لاپەڕەیەکی سپی
وێنەی چەند خاڵێکی ڕەشم کێشا
لەسەر لاپەڕەیەکی ڕەش
وێنەی چەند مەلێکی سپیم کێشا
خاڵ ڕەشەکان سپی بوونەوە
بوون بە مەل و
لەئاسماندا پەڕینەوە
مەلە سپییەکانی سەر لاپەڕە رەشەکەش
بۆ ناو ئاسمان فڕینەوە
شوێنەکانیان بوو بە کانی و تەقینەوە



www.iqra.ahlamontada.com

تۆ مەوەستە هەمیشە بۆ ناو دڵم شۆڕبەوە
تۆ بوەستی خۆری سپێدەم هەڵنایێ
تۆ مەوەستە بڕۆ قووڵایی چاومەوە
تۆ بوەستی گەڵای ڕۆحم سیس ئەبێ
فەلەك لە سووڕان ئەکەوێ
دەریا لە شەپۆل زیز ئەبێ
تۆ مەوەستە
بە ناو خوێنما هەنگاو بنێ
تۆ بوەستی بایەکان هەموو ئەوەستن
بەردی سەری من شەق ئەبێ
مانگ ئەکەوێتە خوارەوە
دڵم هەپروون بە هەپروون ئەبێ



www.iqra.ahlamontada.com

**کێ** ئەتوانێ خۆی لەخۆی بشارێتەوە
نە با ئەتوانێ گڤەی خۆی بشارێتەوە
نە ئاگر گڕوگڵپەی
نە مانگ ئەتوانێ تریفەی خۆی بشارێتەوە
نە شەو تاریکی
هەرچی هەیە لەم کەونەدا
سروشتی خۆی حوکمی ئەکات
کە مەحاڵە بێ ئەو سروشتە هەڵبکات



www.iqra.ahlamontada.com

**کێ** ئەوەندەی رۆحی سەرچاوە خەمبارە
وەرەسەیری برینی کانیان بکە
چەند بە سەختی لە ژێر تاشە ئەتەقنەوە
کەچی هەر زوو
ئاوی سافی لەبەر ئەڕواو جێی ئەهێڵێ
هەور دێت و گەواڵ گەواڵ ژان ئەیگرێ
هەتا دڵی پڕ لە کۆرپەی باران ئەبێ
هەر زوو باران جێی ئەهێڵێ
بەپەلە دێتە خوارەوە
مانگ لە شەوی تاریك هەڵدێ
بێ باکانە تریفە لێی ئەبێتەوە
کێ ئەوەندەی سەرچاوە خەمبارە
کێ ؟



www.iqra.ahlamontada.com

له تێکشکان و کەوتنم
له ژێر فوارەی تاڤگەی خوێن
لەسەره مەرگی بێ چەمکی بوونم
له ڕۆحدان و نوقم بوونی
بەلەمی سەختی لەناو چوونم
هاوارم بۆ تۆ کردووه
دەنگم وەکو ڕەوه مەلێکی ماندوو
لەناو لەمپەرو تەلبەندی بادا مردووه
لەبەر زریان و تۆفانی ئەم زەمەنه
هاوارم بۆ تۆ کردووه
لەکوێی ئەی ونبووی ئەبەدی
ڕەشەبا وا قووتم ئەدا
کەوەستاوم بەدیار تێپەڕینی
بێهوودەی ئەم تەمەنه



www.iqra.ahlamontada.com

تۆ ئاوازێکی دەگمەنی
بەسەر نۆتەی ژیاندا ئەبریسکێیتەوە
تۆ شەپۆلێکی پڕ شەوقی
دەرەوی شوێن و زەمەنی
بەسەر دڵی کەناردا ئەشەکێیتەوە
ئەڵێی تیشکی خۆرەتاوی
بەسەر کێڵگەی گوڵە گەنم
وەك گیا ئەبوژێیتەوە
چی وشەی گەرمی پڕ شیر بوو
بەتۆم بەخشی
ئەها شیعر وەك ڕووبار لەبەرم ئەڕوا
ئێستاش ئەوە منم وەك لقەدارێکی بەربا
تەنهاترین تەنها



www.iqra.ahlamontada.com

**كە** ڕەشەبا هەڵیکرد
تۆ زرێی ئیرادە لەبەرکە، بەڕوویا هەڵشاخێ
لە چاوەڕوانی مەوەستە ئاخۆ کەی هەڵئەکا
کە ئاگر داگیرسا تۆ کێڵگەی هەور لەسەرکە
بڕۆ ناو بلێسەی
لە چاوەڕوانیدا مەوەستە ئاخۆ کەی داگیرسێ
پڵنگێ لە ناخی تۆدایە شاراوەو پۆلا شکێنە
مەرگ ڕاپێچی مەرگ ئەکا
لەسەر دوو پێی خۆت ئەتوەستێنێ
لەکەوتنی ئەبەدی ڕزگارت ئەکا



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک** بروسك تاوی ئەدا
تیشکی خۆر لە قژی بەستراوی ئەدا
هەڵمی زێڕی لێ هەڵئەسا
با لە تەلی کەوانی ناو دەستی ئەدا
ئاگری ئاوازێکی خەمگین دائەگیرسا
سوار تاوی ئەدا و تاوی ئەدا
کە کەوتە کەمینی تیرەندازێ
شەوقی چاوی کوژایەوە
ئاسمان ئەسرینی دارژا
فوارەی خوێنی سوارەی هەتاو
بەسەر تاشەکان هەڵپژا



www.iqra.ahlamontada.com

**بەدوای** با ڕامکردووە
ڕاپێچی خەرەندی کردوومە
ڕێگای دوورو درێژی زوڵمەتم بڕیوە
هەمیشە بنبەست قووتی داوم
بەدوای خوا کەوتوومە
هەمیشە وەهم لوولی داوم
بۆ بینینی سیوەیل
چوومەتە ترۆپك و لوتکەکان
بروسکی مەینەتی بیابان لێی داوم
بەپانتایی کەون بەدوای تۆ رامکردووە
ئەی گیای نەمری ئەم کەونە
هەمیشە تەنهایی ئەبەدی
بۆ ناو هات و نەهات ڕایداوم



www.iqra.ahlamontada.com

**خوێنەرەکە** چەند شێت بوو
هەموو کتێبەکانی خۆی سووتاند
خۆینەرەکە چەند ئازا بوو
هەموو بەربەستەکانی ڕووخاند
خوێنەرەکە  عاشقی دارستان بوو
هەموو درەختەکانی شکاند
خوێنەرەکە بە ئاگری کتێب خۆی سووتاند



www.iqra.ahlamontada.com

**شەو** وەك دایكێكی ڕەشپۆش
كپ و بێدەنگ
ئەستێرەكانی ئاسمانی
بە چیرۆكی خەمباری خۆی ڕاگرتووە
دارستان كپ و بێدەنگ
گڤەی باكانی سەر دەریای
بە وەرینی گەڵاكانی وەستاندووە
ڕووبار كپ و بێدەنگ
شەپۆلەكانی ناخی خۆی
بەلایلایەی هەڵرژانی خەوتاندووە
لەناكاو قیرەی بۆقەكان
كپی ئەو شەوە ئەبەزێنن
ئەوانیش ئیمپراتۆریەتی خۆیان
لە زەمەن دادەمەزرێنن



www.iqra.ahlamontada.com

**ئازیزن** له ناو خوێنمان ئه‌ژین
ده‌ستمان له ناو ده‌ستیان ئه‌نێین
به‌یه‌که‌وه گۆرانی ئه‌چڕین
له شوێنه به‌رزه‌کاندا
سه‌یری ئاوابوونی ئاسۆ ئه‌که‌ین
ئازیزن نه له چاو ئه‌بنه‌وه
نه‌له دڵ به‌ر ئه‌بن
کاتێکیش که ئه‌ڕۆن
له‌بیریان ئه‌که‌ین و
بۆ ئه‌به‌د ون ئه‌بن



www.iqra.ahlamontada.com

تۆ بۆ کوێ چووی
ئاوا ئەسپی کەرەندی خۆت جێ هێشتووە و
منت داوەتە بای زەمان
تۆ بۆ کوێ چووی شمشاڵی خۆت
بۆ حەیرانی پڕ لە ناڵەم جێهێشتووە
منت داوەتە دەست رەندەو پاچی ڕمان
ئێستا تەنهام لە کورەی باخی نیشتیمان
خەمبارترین ئاگر تاشم
لە کانی گڕی نیشتیمان، تینووترین ئاگرنۆشم
تۆ بۆ کوێ چووی
ئەسپ و کەوان و شمشاڵت جێهێشتووە
کیسەی ئەندێشەوڕامانت
لە نێو شیعرەکانی مندا جێهێشتووە
تۆ بۆ کوێ چووی؟

* ئەسپی کەرەندی : رنگی زەردی تێکەل بە سوور



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک** چۆن کە مەل
هەڵئەفڕێتە دوورترین دۆڵ
با لە ژێر تۆف و زریان بێ
هەر دێتەوە لانەکەی خۆی
یا مێروولە بۆ هەر لایێ سەرهەڵگرێ
با هەنگاویشی زۆر ورد بێ
هەر ئەچێتەوە شاری خۆی
یا ئاو بۆ هەر لایێ بڕوا
ئەڕژێتەوە سەرچاوەی خۆی
ئاوا منیش کە عاشقی
شوێنە دوور دوور دوورەکانم
بۆ تا هەتا
هەر دێمەوە باوەشی تۆ نیشتیمانم



www.iqra.ahlamontada.com

**جەر** لە ئاگر من ئاگردانم بینیوە
پێش بلێسە داگیرساوم
پێش خۆرەتاوئاشنای رووناکی بوویمە
پێش گوڵەگەنم
دەستم لەمل کێڵگە دوورەکان کردووە
چراچرا داییساوم
بەرلەبەهار گیا لە ناخم شین بووە
بەرلەبەفر بەسەر لووتکەکان باریوم
وشەم لەزەوی چاندووە
پەییم بە نهێنی ئەوینی تۆ بردووە
باخچەی گومانم پرلە گوڵی یەقین کردووە
بەر لەوەی سروشت
چرۆی زەوی برسکێنێ
دەمی شیعرم کردۆتەوە
تا تا نیازی بوون بدرکێبێ
پێش دەریا لە شەپۆلم داوە
بەر لەوەی ڕەشەبا هەڵکا
گۆڕم بۆ وەرین لێداوە



www.iqra.ahlamontada.com

**بەهەر** کوچەیێ ڕائەبرم
یادێکی تۆ بانگم ئەکا
ئەچمە هەر کافێیەکی شار
مێزەکەی تۆ لووڵم ئەدا
بۆهەر لایێ سەرهەڵئەگرم
گەڵاوگوڵی درەختێکت
لەچاوی بەد داڵدەم ئەدا
ئەچمەوە ناو هەر ڕووبارێ
وێنەیەکت خۆی ئەنوێنێ
ئەچمەوە شوێنە دوورەکان
هەمدیس سەدای ناسکی تۆ ئەمڕفێنێ
بچمەوە ئەو سەری دونیاش
تۆ لەگەڵما ڕێگە ئەبڕی
تۆ ماڵە گەورەکەی منی
هەرتۆ لەباوەشم ئەگری
نیشتیمانم



www.iqra.ahlamontada.com

**کوێم** لەناڵەی وشەی خەمگین خەمگین ئەبوو
ڕستەی کورت کورت لەبەرچاوم هەڵئەفڕین
ناونیشانی شیعرم ئەدی
یەك یەك خۆیان ئەسڕیەوە
دێڕ دێڕ تێکەڵ بەیەك ئەبوون
خاڵ بانگی وێرگوڵی ئەکرد
لامی لاواز لامی قەڵەوی ماچ ئەکرد
مانای بەهێز
پەنجەی لەڕی بێمانایی ئەبڕییەوە
هەموو شتێ تێکچڕژابوو
لەناو دڵی ئەو سەبەتەی لە تەکما بوو
کە تژی بوو لەو کاغەزە دڕاوانەی
شیعریان لەسەر نووسرابوو



www.iqra.ahlamontada.com

**كە** یەكەم پڕووشە
عەتری خاك لە كێڵگە هەڵئەگرێ و
بە دونیای ئەبەشێتەوە
تۆم بە بیر دێتەوە
كە نەسیم هەلالە هەڵئەمژێ و ئارامی ئەگوازێتەوە
تۆم بە بیر دێتەوە
خەیاڵم وەك تاڤگە هەڵئەڕژێ و بۆم كۆ ناكرێتەوە
دوا پێكی نیوەشەو هەڵئەدەم
وەك چڵەدارێكی ڕاچڵەكیو
ڕیشەی كەوناری خۆم بیر دێتەوە
تۆ لە كوێی؟



www.iqra.ahlamontada.com

**گریانی** من گریانی گەلێکی ستەم لێکراوە
سەری لە بەرەبەیانی مێژووە
بنی لە دەریا داگیرساوە
نە وچانی هەیە نە هەدادان
وەك خۆڵەمێشی ئاگردان
فڕێ دراوەتە سەر ئەم زەمینە
نە ئاسمان رایانئەگرێت و
نە زەوی داڵدەیان ئەدا
نە دانا کەشتیان ئەگێڕێ نە نادان
نە خوداش ئەم تەیرە غەریبە
بە هی خۆی ئەزانێ نەشەیتان



www.iqra.ahlamontada.com

**من** هەمیشە دێڕی سپی ئەخوێنمەوە
ئەو هەمیشە دێڕەکان ڕەش ئەکاتەوە
من بیر ئەکەمەوە ، ئەو بیر لێئەدا
کە ئەکەوم ئەڕژێمە ناو گۆزەی عەشق
وەك ئاوی پاك ئەخورێمەوە
کە ئەکەوێ تەواو ئەبێ و ئەتوێتەوە
ئەو بە ڕقی ڕەش مەست ئەبێ
من بە ئاوی دەمی ترێ
من کراوە ئەو داخراو
من گران بە سەنگی شیعر و وشەی دانا
ئەو سووك بە خەونی بێ مانا
من ئاڵ ، ئەو تاڵ
من کلیل و ئەو گرێ
ئەو ژەهری هەلا بۆ شەراب
من گەورەترین هێشووی ترێ
من کپ ئەو دەنگ
من رەنگ ئەو جەنگ
وەك دوو هێڵی هاوتەریبین
نە پێکئەگەین، نە لێکئەگەین



www.iqra.ahlamontada.com

**وەرە** سەیری برینم کە
نە دەریایەکم هەیە
خۆڵەمێشی سووتانی خۆمی تێکەڵ کەم
نە ڕووبارێ لە کەناریەوە دانیشم
نە بەهارێ، نە سێبەرێ
نە عاشقێ، نە مەعشووقێ
نە کتێبێ، نە دەفتەرێ
نە گەورەیێ، نە بچووکێ
نە سەروەرێ
ئاخر کە نیشتیمان نەبوو
ڕووباریشم پڕ خوێ ئەبێ
مەلیش بەسەرما نانیشێ
هەموو شتێ وێران ئەبێ
نیشتیمانم تۆیان لە کوێ بەند کردووە؟



www.iqra.ahlamontada.com

**هەموو** ڕەت بوون، کەس ئاوڕی نەدابەوە
ئەوان خەونی خۆشیان جێهێشت
یەکیان سەعاتی دڵی خۆی
یەکیان ئەستێرەی سەرشانی
یەکیان یادویادەوەری
یەکیان کتێبی سەروەری
هەموو ڕۆشتن ، کەس ئاوڕی نەدایەوە
یەکیان پشکۆی ناو ئاگردان
یەکیان رەختەکەو فیشەکدان
یەکیان ئەلبۆمی وێنەی خۆی
یەکیان شیری منالّی خۆی
هەموو ژەهری خۆیان هەڵڕێشت
خاکیان بۆ مۆرانە جێهێشت



www.iqra.ahlamontada.com

لەدامێن و بناراندا کاتێ کە مانگ
کراسی ڕەشی هەوری پۆشیوە
بەسەر تاشەو زناراندا کە تاریکی
ژەهری هەشی خۆی نووسیوە
لەزریان و کرێوەدا
لەژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرەدا
خەون ئەبینم خەون ئەبینم
لەکاتی مەستی کاتی ئاگاهی
لەناو باخەکان، کاتێ کەوا خۆخ
تووکی لە ناو بای ڕسکان ئەنێژێ
لەسەر شاخەکان، کاتێ کە گیا
شەڵاڵمان ئەکاو عەتر ئەڕێژێ
خەون ئەبینم خەون ئەبینم
لەبەر رەشەباو کانگەی ڤبانم
لە سەختەندازی مان و نەمانم
هەمیشە بەتۆ خەون ئەبینم
ئەی نیشتیمانم



www.iqra.ahlamontada.com

**هێشتا** دەریا ئەوەندە شین و قووڵ نەبوو
هێشتا بیابان ئەوەندە دوور و درێژ نەبوو
چیاش ئەوەندە لێژ نەبوو
کاتێ کەوا من تۆم هەبوو
نە ئاگر ئەوەندە سارد بوو
نە بەفر ئەوەندە گەرم
مەل بە سەر شانەوە ئەنیشت
گیا لە ناو لەپ شین ئەبوو
دڵی هەتاو وا داغ نەبوو
کاتێ کە من تۆم خۆشەویست
ئێستاش تۆ وەك دەریا پڕی
وەك بیابان دوورو درێژ
وەك چیا لێژ
نەتۆ دێیەوە دیدارم
نە ئەستێرەی نیوە شەوێ
نەمەل بەسەر شان ئەنیشێ
نە گیا لەناو لەپ شین ئەبێ
بەڵام من هەر وەکو جاران تۆم خۆشئەوێ



www.iqra.ahlamontada.com

**که** جلی سپی بەفرت پۆشیوە
جارجار دائەڕژێی
جێ بە نووتەکەی شەوان لەق ئەکەی
ئەی دڵی گەرمی باخەوانی با
کە لەژێر سینەی خاکا لێئەدەی
ئەوەی خۆشمویست
وەکو ئەستێرەی سیوەیل ئاوابوو
هەندێ بوون بە مەل
بۆ ناو دارستان هەڵفڕینەوە
هەندێ بوون بە ئاو
بەسەر بواری تاشەبەردەکاندا پەڕینەوە
کەوتنە قووڵایی یادو خەونەوە
جارجار تیشکی خۆت بۆ لایان باوێ
بەڵکو بۆ جارێ
لەبەر دیدەی من بەدیار کەونەوە
تا گیاو ئەڤین
لە گیانی مندا زیندوو ببنەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**کۆلّمی** گەنمی قەندەهاری
جامێ لە شیر
مشتێ شەکرو قاپێ هەنگوین
قەیرێ گریەی کامەرانی
دەمێکی پڕ لە پێکەنین
بەسە بۆوەی هەزاران هەزار ساڵ بژین
یەکدو نان و سێچوار پشکۆ
باخێ لەبەی لە تەمتوومان سپی ئەکا
بەشی هەموو دونیا ئەکا
دڵتەنگ مەبە جێگەی تۆ هەر ئەبێتەوە
دونیا بەشی هەموان دەکا



www.iqra.ahlamontada.com

**له دەرگای** باکوورەوە بۆ لات دێم
تۆ دەرگای باشوور دائەخەی
بە سەر شورەوە بۆ لات دێم
هەموو دەرگاکان دائەخەی
بە هەموو دەرگاکان بۆ لات دێم
تۆ شورەکان بڵند ئەکەی
لە ژێر زەوییەوە بۆ لات دێم
دەرگای ئاسمان دائەخەی
بە ئاسمانەوە بۆ لات دێم
دەرگای سەر زەوی دائەخەی
تۆ هەر دەرگاکان دائەخەی
منیش هەر کلیل دروست ئەکەم
ئێستا دڵی تۆ پڕە لە دەرگای داخراو
ماڵەکەی منیش پڕە لە کلیل



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆ** هەمیشە بەسەر پشتی بایەکان دێی
چاوم پڕ ئەکەی لە جوانی و رائەبووری
عەتری باخت هەڵئەڕێژی
گیانم شەلاڵی خۆت ئەکەی
دەستێ دێنی بە سینەما
دڵم لەگەڵ خۆتا ئەبەی
چۆن ئەکرێ بات بۆ رابگرم
نەهێڵم ڕێی دارستان بگرێ
ئەی با ئەی با چەند بە پەلەی؟



www.iqra.ahlamontada.com

**هاینی** دەریام بەدواتا نارد نەهاتییەوە
پەری باڵداری ئاسمانانم، بەدواتا نارد نەهاتییەوە
سواری ئەسپی ئەفسانە بووم
سەرزەمینم هەموو تەی کرد
بەڵام تۆ هەر نەهاتییەوە
ئەوێستاکەش تەنهاترین تەنهای زەویم
نە ئاگرم دائەگیرسێ نە ئەسێرەم ئەکوژێتەوە
کەی تۆ ئەگەی
دەمم پڕ قەندی ژیان کەی
شەوگاری من
لەناو چرای لەپت بەند کەی؟



www.iqra.ahlamontada.com

**وەك** چۆن مرواری
کە لەبەر هەتاو درەوشایەوە
نیشتیمانی خۆی بنبزر کردو لەبیری نەما
وەك چۆن کە ئەڵماس شەوقی سپی خۆی
بەسەر مەچەکی ئاوریشمت بینی
ڕابردووی ڕەشی خۆی لەبیرنەما
یاخود زێ ئاوێ کاتێ تێکەڵی دەریا ئەبێتن
ئاوازی گەرمی جۆگەو جۆباری لەبیر ئەچێتن
ئاواتۆ منت لە ناو کتێبی وجود لەبیر کرد
بەڵام با هەر من بەرز هەڵفرم
بگەم بە پەیوار
یا بەرەو بنی دونیا ڕابکەم
هەرگیزاو هەرگیز تۆ لەبیرناکەم



www.iqra.ahlamontada.com

**درەنگە** درەنگ

تازە چۆن شەوقی تۆ کۆکەمەوە

کە شەوقت بەناو بادا ڕژاوە

تازە چۆن بگەم بە تابانی تۆ

کە مانگ لەمێژە سەری هەڵگرتووە

درەنگە درەنگ

ڕۆژو مانگ و ساڵ تێپەڕین

من هێشتاکە لەدەرگای دڵی تۆم نەداوە

ئێستا تۆ لەناو بورجی هەتاوی

چۆن بگەم بە تۆ

کەوا شاباڵی فڕین سووتاوە؟



www.iqra.ahlamontada.com

**هەموو**ساڵێ کاتێ گیا
حوبری سەوزی خۆی ئەڕێژێ و
تەپ و تۆزی رۆحی ئینسان ڕائەماڵێ
درەختەکان پڕ لەشیری خودا ئەبن
ئەڵێم ئۆخەی دیارە ساڵێ تریش ئەژیم
بۆیە هەموو سەرە وەرزان
سەرێ لە باخچەکان ئەدەم
خووم بەو باوەڕە گرتووە
ئەوەیش کە بۆی گێڕامەوە
زۆر لە مێژە لەباوەشی خاك خەوتووە



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەوە** منم باوەشێ بام ڕاگرتووە
تیشکی خۆرم لە کەمەرم ئاڵاندووە
مانگم لە ئاسمان هێناوە
ئاگرم لە ڕەیۆس دزیوە
بەردم بە کۆڵ هەڵگرتووە
ئەوە تۆی هێشتا لە دارستان ئەژی
ڕێ ڕێ شەوق خامۆش ئەکەی
جام جام تاریکی ئەڕێژی
بەدەستێ مۆم ئەکوژێنییەوە
بە دەستێ جوانیی ئەنێژی
وەك دوو ئاو واین
هەندێ جار بەناو یەکا دائەڕژێین
هەندێ جاریش ناگەین بەیەك
بەناو خاك و خۆڵ ئەپژێین



www.iqra.ahlamontada.com

**به دیار** دەریاوە ڕاوەستام
نەوڕەسەکانم بیر کەوتەوە
بە ناو بیابانەوە وەستام
تێنووەکانم بیر کەوتەوە
بە ناو دارستانەکانەوە وەستام
گەڵا زەردەکانم بیرکەوتەوە
بە ناو ڕێگاکاندا وەستام
ڕێبوارەکانم بیرکەوتەوە
بە ناو تەمتووماندا وەستام
کۆترەکانم بیرکەوتەوە
بە ناو بەفردا وەستام
ریشۆڵەکانم بیر کەوتەوە
بە ناو کتێبەکاندا وەستام
ماڵاوایی یەکجاری تۆم بیرکەوتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**من** بۆ ئەوان ئاگری خواکانم ئەدزی
کتێبی باو ناو لەپی گومانم ئەخوێندەوە
گەڵای ڕۆحم بۆ رەنگرێژ ئەکردن
ئاوی ژێر تاشەبەردم بۆ دائەنان
بەدەنگی نەی مەستم ئەکردن
تەمتوومانم بۆ ئەهێنان
چونکە ئەوان لە باوەشی زریان ئەخەوتن
لە ناو وەهمی گەڕانەوە
بۆ باوەشی خاك ئەمردن
بێ پەروا مەحاڵم بۆ ئەگرتن
ئێستاش لە ناو ئەم وجوودەدا
گۆڕ بۆ یادو یادەوەری هەڵئەکەنین
لە حەسرەت و خەمگینیدا
بۆ ڕابردووی تەوقی سەرمان پێئەکەنین
لەبەر دەرگای ئایندەشا
هۆڕ هۆڕ ئەگرین



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک** کاسەی شەرابی شکاو
پەرش و بڵاوی ناو کتێب و
ڕستەی جاویدانی بوویمە
بە باوەشێ ئاوی ڕژاوی ژێر تاشە
بەرەو دڵی دەریا چوویمە
لە قامیشەڵانە دوورەکان
ئازارم بۆ گەرووی داغی نەی هێناوە
من تەنیام و بەوری سپی شیعری مەزن
لە بێشەڵانی رۆحمدا بەجێماوە
لە هیچ کەنارێ لەنگەرم نەگرتووە
لە هەزاران سەختەندازی ژینم داوە
من ڕۆحێکی سپی سپیم
ئەڵێی داڵدەی بەفرم داوە
شیعر ئەی کانی کانان
بەتۆوەیە من ئەبینم
زەبری تۆیە بتەکانی پێ ئەشکێنم



www.iqra.ahlamontada.com

**دڵۆپێکی** بەختەوەر بووم
لە گیا ئەترووسکامەوە
بووم بە جۆبار
گەورەبووم و بووم بە ڕووبار
ڕووبار هەڵیدامە دەریا
دواجار ئۆقیانووس قووتی دام
ئێستا من ونترین ونی
ناو شەپۆل و گێژەنی شێت و ڕەشەبام
بریا من هەر دڵۆپە بام



www.iqra.ahlamontada.com

**ژیلەمۆیەکی** بچووك بووم
لەنێو ئاگردانی وجوود
بووم بە مەشخەڵ و داگیرسام
نێڵەم گەیشتە ئاسمان
لە ڕەشەبا پووکامەوە
بووم بە گەرداوی خۆڵەمێش
دووبارە داگیرسامەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک** چۆن ڕووبار بۆ هەرلایەکا هەڵڕژێ
هاژەی خۆی لەگەڵدایە
یا مەلەکان بۆ هەر لایەکا هەڵفڕن
جریوەیان لەسەر زمان
شەقەقەی باڵیان لە خوێندایە
تۆش وێنەکانت لە چاوو
دەنگت لە گوێ
ناوت لە دڵ
بوونت لە نێو هەستم دایە
منیش ئاوا بۆ هەر سەرزەمینێ بچم
مشتێ خۆڵی نیشتیمانم
لەناو خەزنەی سینەدایە



www.iqra.ahlamontada.com

**هۆراشیۆ** هاوڕێم هۆراشیۆ من هاملێتێکی خەمگینم
یەقین لەسەرم مردووە
کاردی گومان ئەو دڵەی لەت لەت کردووە
فریام کەوە وا خەریکە بینین لە چاوم ڕائەکا
مەرگ وەك ئۆفیلیای سپی
لەناو خوێنم سەما ئەکا
هۆراشیۆ هاوڕێم هۆراشیۆ من هاملێتێکی خەمگینم
گیا لە برینم شین بووە
شمشێری دەستی تەنهاییم،
وەك ئاڵا ئەشەکێتەوە
ئەزانم جەستەم شەق ئەکا
هۆراشیۆ هاوڕێم هۆراشیۆ
ئەو گومانە هەر ئەمکوژێ
عەرشی وجودم لەق ئەکا
فریام کەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**بێرەوە** ڕەت دەبێ وەك ڕمی سەر سینەی تاریکی
ژەنگی سەر دڵی بوون وەك تەنەر هەڵدەگرێ
مراوی ئاوەکان وەك ئاونگ دەبریسکێنێتەوە
دەقەکان پڕ دەکا لە سکڵ و میتافۆر
تابلۆکان مشت دەکا لە زەیتی هەمایۆن
بێرەوە رەت دەبێ
سینەمان شەلاڵی شەرابی سەد ساڵە دەکات
مێژووی ناشیرین دەخاتە ژێر سمی ئەسپی نوور
تەوتەم و تابۆکان بە گورزی برووسکە ئەشکێنی
سەهۆڵبەندی دڵە ڕەقەکان ئەتاوێنێتەوە
بێرەوە ڕەت ئەبێ رووناکی
کەهاتی یۆتۆپیایەك بێنە خاڵی بێت
لە قەفەی زنجیر و لەزرمەی شمێرو
قوفڵی سەر زمانی ئازادی
کە هاتی بمگرە باوەشی گەرمی خۆت
ڕەهاییم بدەرێ و ڕزگارم کە لە کۆت



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەشتار** سەدان جار منی کوشت
دڵی پارەپارە کردم
جام جام خوێنی لێ هەڵمژتم
هەر نەمردم
بۆ ئاگری ئەوینی خۆی
ئاوی دەریای پێ ڕاکێشام
چیاکانی پێ گواستمەوە
بەردی مەرگی پێ شکاندم
هەر نەمردم
ئەنکیدۆی وردو خاش کردم
هەموو خواکانی لێ هاندام
ئێسك و پرووسکی لە ئاش کردم
هەر نەمردم
تازە ئورۆك ئەی نیشتیمان
گوڵی خلودم بۆ چییە؟



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆ چەند** درەنگ، درەنگ درەنگ
ئەو دڵەی من جێئەهێڵێ و دێیتە گلێنەی چاومەوە
تۆ چەند زوو، زوو زوو
گلێنەی چاوم جێئەهێڵێ و ئەگەڕێیتەوە دڵمەوە
لە میانی ئەم دڵ و چاوە
لە داگیرسانی ئەبەدیم



www.iqra.ahlamontada.com

**کە** چوومەوە شوێنەکەی جاران

ئاسمان هێشتا هەروا شین بوو

ئاوی ژێر تاشە هەر مابوو

تەنها تۆ بووی لە چەشنی با

نەڕەنگت هەبوو نە سیما



www.iqra.ahlamontada.com

**ئاگر،** ئاگری ئەوینت
هەر ئەڵێی شەرابی سوورە
لەناو خوێنم دائەگیرسێ
بەفر بەفری دووریت
ئەڵێی چلوورەی جەمسەرە
لەناو ڕۆحم ئەتوێتەوە
هاتنیشت ئەڵێی بادەی سەد ساڵەیە
هەڵئەڕژێتە ناو سەرمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**شەوەزەنگ** بوو بەدیارکەوتی
دونیا شەڵاڵی هەتاو بوو
هەتاو لە ناخی ئاسمان بوو، کە ونبووی
دونیا خڵتانی تاریکی بوو
بوونت ڕۆژەو نەبوونت شەو
تۆ کامیانی ئەی کەونارترین پێشەنگم
کە من بۆ تۆ جەنگاوەرێکی ناو سەراب
لەسەنگەرێکی پڕ شووشەی ئاڵی شەراب



www.iqra.ahlamontada.com

**شەختەبەندی** سەراوەکانم شکاند
ژمارەی پێوانەییم شکاند
قەڵەمی خوم شکاندن، شەرمم شکاند
هەر لە مانای شکان نەگەیشتم
بەڵام کاتێ شووشەی دڵمت وەك گوێز شکاند
ئەوسا لە ماناو ئاوازی شکان گەیشتم



www.iqra.ahlamontada.com

جێ چەتر بووم
بارانی ئەوینت شەڵاڵی سووتانی کردم
فڕیم تا دوا سنوور فڕیم
هێزی ئەوینت شاباڵی بەستم
کەوتمە مەلەی ناو ئاگاهی
ئەوسا زانیم من مەسترین مەستم
ئەوە خەونە ئەیگێڕمەوە
یاخود بەدوای خەون کەوتووم ؟



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆ** هەمیشە پەنجەرەکان دائەخەیت و
کتێبم بۆ ئەکەیتەوە
چەند ڕستەیێ ئەخوێنییەوە و کۆنە برینم ئەکولێنییەوە
ئەمجارەیان کتێبەکان دائەخەیت و
پەنجەرەکان ئەکەیتەوە
دوای شنەبایەکی چیایی
بۆ باوەشی میهری خۆتم ئەبەیتەوە
هەندێجاریش هەم پەنجەرە ئەکەیتەوە
هەم کتێبیش
ئیدی لەباوەشم ئەگری و بۆ سپێدەم ئەبەیتەوە
جارناجاریش هەم پەنجەرەم لێ دائەخەی
هەم کتێبیش کلیل ئەدەی
چراکانیش خامۆش ئەکەی
بە ئەسپایی بۆ ناو سینەی خۆتم ئەبەی
دواجاریش هەم پەنجەرەو هەم کتێبیش ئەکەیتەوە
ئیدی جوانی و شیعرو قەڵەم بەناو یەکا ئەتوێنەوە
ئەوسا لە دووری دوورەوە
خۆرەتاو سڵاوێ ئەکاو
وەکو نوور دێتە ژوورەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**چەند** سەختە ئەوینت
ئەوینت چەند سەختە
سەد ساڵە دیلی ناو ستەمە
کەسەر دەرئەهێنێ
وەك گیای ئاڵەکۆك بەفر دایئەپۆشێ و
ئازادی و دونیای گەش نابینێ



www.iqra.ahlamontada.com

ئەی پێشڕەوی گومان
هەموو شوێنپێکان یەقینی تۆ بوون
لەنێو ئەم تاریکە شەوەدا
کە تاریکترین زیندانی وجوودە
بلێسەیان لێ هەڵئەسا
ئەفسانەی درەوشاوەت
ئەژنۆی پێ شلکردم
وەك ئەڵماسی بەفر
تا ئەهات چاوی ئەسپی ژینی کول ئەکردم
دواجار لەنێو یۆتۆپیای گەیشتن بە تۆ
وەك پەپولەیەکی خەمگین
لەناو لەپی ئاگراوی تۆدا مردم



www.iqra.ahlamontada.com

**کەسێ** دێ ئەو ناوە پر بروسك ئەكات
باوەشی پڕە لە شەتڵی ئومێد
لە باخەكانی ڕۆحی ئەچینێ
دڵی پڕە لە ئاگر
لەمپەری سەر ڕێگاكان ئەسووتێنێ
بیابان پڕ لە ئاو ئەكا
شەوە درێژەكان كورت ئەكاتەوە
ئاسمان دێنێتە جێی زەوی
زەوی بۆ ئاسمان ئەباتەوە
كەسێ دێ
بەڵام ئەوكەسە هەرگیز ناگات



www.iqra.ahlamontada.com

ئەی ژن تەنها بەیانی باشێکت
بەشی هەموو خەمان ئەکات
تەنها بزەو نیگایەکت
بەشی هەموو زەمان ئەکات
دەرکەوتنت خۆرە
قەڵای تاریکی ئەڕمێنێ
ئاوابوونت تاریکییە
سەری ڕووناکی پەل ئەداو ئەپەڕێنێ
تەنها بەیانی باشێکت
کانیاوی نووری ئەبەدی ئەتەقێنێ
ڕەونەقی تابلۆکانی مانی ئەشکێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

هەر لەدەمی کەونارەوە تاکو ئێستا
هەریەك لە دامێنی کێوێ
بەسروەی با
خۆڵەمێشی سووتانی خۆی
بۆ ئەویتریان ئەنێرێ
لەسای ئەوین ئەسووتێن و ئەتوێنەوە
تا دواجار لەناو فیراقی ئەبەدی ئەبڕێنەوە
ئێستاش بچیە چیمەنی سەر ئەم دووکێوە
وەك دوو درەختێ بە پێوە
بەشەو ئەبن بە سێوەیلی ئاسمان
سپێدانیش ئەبن بە شەکری تەمتوومان



www.iqra.ahlamontada.com

## دڵێکم هەیە

هەر ئەڵێی گۆزەی شەرابی شکاوە
کێ دێ ئەو دڵەی من بداتەوە
لە نێو سینەمدا ئاگرێ هەیە
هەر ئەڵێی کوانووی
سکڵ و پشکۆیە وا داییساوە
کێ بێ ئەو ئاگرە بکوژێنێتەوە
لە ناو خوێنمدا بەفرێ هەڵئەکا
کەی دێ ئەو بەفرە بڕەوێتەوە
ئاخ بۆ دڵەکەم گۆزەی شکاوە
ئەوەی ئەستێرەی سیوەیلی من بوو
کەی دێ ئەم گۆزە چاك بکاتەوە؟



www.iqra.ahlamontada.com

**که** له دەست ژیاندا ڕامکرد
خۆم له ماڵی مانگ شاردەوە
بەڵام هەمیشە خەونم بە زەوییەوە ئەبینی
که لەدەست لافاودا رامکرد
چوومە بیابان
بەڵام هەمیشە خەونم بە ئاوەوە ئەبینی
گەڕامەوە چوومەوە ماڵی ژیان
بەڵام هەمدیس خەونم بە گۆڕستانەوە ئەبینی
چ قەدەرێکی سەختە
هەمیشە بەردی ڕاکردنت بەکۆڵەوە بێت



www.iqra.ahlamontada.com

**که** لەشەوی درێژی ژیان دەرئەکەوی
سامال ئەرژێتە خوارەوە
مانگ ئەشکێت و تریفە بەدونیا وەرئەبێ
ڕووبار ئەگەڕێتەوە دواوە
خاك لەبەر پێت سەما ئەکا
کە لەشەبەیخوونی ژیان دەرئەکەوی
جەنگاوەرەکان سەنگەر چۆل ئەکەن
ئەگەڕێنەوە دەشتایی
مەی نامینێ و بەرناکەوێ
لەنێو مەیخانە و باڕەکان
قەڵەمەکان زاووزێ ئەکەن
دونیا پڕ ئەبێ لە کتێب
کەنارەکان پڕ لە گەوهەری ئاو ئەبن
بەهەزاران هەزار شاعیر
لە ژێر مرواری شەوقی تۆدا ون ئەبن
عاشقەکان ئاگر ئەگرن لە تاوان
بەڵام کاتێ کە ون ئەبیت
کەون تاریك هەڵئەگەڕێ
هەموو شتێ ڕەش ئەبێتن لەبەر چاوان



www.iqra.ahlamontada.com

ئەی دڵ، دڵی هەزاران ساڵ شکاو
دڵی بەناو ئەوین تکاو
گۆزەی بەناو خەون ڕژاو
ئەی یەقینی
بەناو کێڵگەی گومان پژاو
کەی دێیتەدەر وەکو جاران
بۆ شووشتنەوەی گەڵای ڕزیوی ناخمان
خۆمان هەڵخەین
لەبەر ڕێژنەی توندی باران



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک** ئەستێرەکان داڕژا
وەك شەربەتی شیعری قەرەجان
لەبەر دەستی من هەڵپژا
سپی دەچێتەوە سپی
وەك کەفچەری ئەوبەری دەریا
ئەچم بۆلای ئەسپی سپی
تەنکە ئاوێکی شیرینە
ئەڕژێتە ناو خۆڵی بیابان
ئەحیلێنێ و بانگم ئەکات
ئەسپی سپیم
نە بەماڵەکەی ئەکەوم، نەگۆڕەکەی
لە دوورەوە ئەیبینم
وەك شمشێر ئەبریسکێتەوە
وەك سەرخۆشێ لەناو یادەوەرییەکانی
ڕەباز بووبێ ئاوەها ئەترینگێتەوە
ئەسپی سپیم کتێبێکە
لەبەر باخەڵی سوور پێستێ
زینێکە لەزیوی جریوەی دارستان
سەدایەکە لە چریکەی ئینسان



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەچم** بۆلای ئەسپی سپی
لەهەر کوێیەکی دونیابێ
شووشە عەتری شاعیرێکی شکاوە
لەهەر کاتێ کەقەڵەمی دەرهێنا بێ
ئەسپەکەم کێ بردی؟



www.iqra.ahlamontada.com

## لەدرەوشانەوەی خۆت کەمکەرەوە

ئەی درەوشاوەتر لە مانگ

کە درەوشانەوەت هەموو چاوەکانی داخستبێ

ئەی دڵ چون سەیری تۆ بکات ؟

دڵ خەزنەی شەرابی ئەوینە

بەڵام چاوە

ئاگر لە شەرابی جاویدانی تۆ بەرئەدا ت

تریفە بۆ مەستی ڕائەخات

کە درەوشانەوەت هەموو چاوێکی داخستبێ

دڵ چۆن سفرەی ئەو شەرابە

لەبەر دەرگای تۆ ڕابخات



www.iqra.ahlamontada.com

**هاواری** بەهێز لە دڵەوە دێت
نەک لە زمان
من بە زمان هاوارم کرد
تۆ دڵت ڕمان



www.iqra.ahlamontada.com

**له دوور** دووره‌وه ئه‌سپێک دێ

ئاگر له‌سمی هه‌ڵده‌چێ

ئه‌و ئه‌سپه نیشتیمانی ون کردووه‌و ناگاته جێ



www.iqra.ahlamontada.com

**شەونمیش** ناترووسکێتەوە
کە تۆ لە بن باڵی غەیبی
نە شەرابیش دەخورێتەوە
کە تۆ ئەلکۆلی ژیانت
لە شووشەی من شاردۆتەوە
سحریش ئاگر ناکاتەوە
کە تۆ سیحربازەکانت
بۆ ناو وەهم ناردۆتەوە
هەموو شتێ لە ناو لەپت
بەرگی ئەبەد لەبەر دەکا
ئەم بوونە بۆ ئەوینی من مەیسەر ئەکا



www.iqra.ahlamontada.com

**سەما** ئەکاو چای سەماوەر ئەخواتەوە
سەوسەن دەکا بە تایتل و لە سیڕەی هەڵۆیان ئەترسێ
سینەماکارەکە  چەند گوناهە
هەر لە شەوەوە تا بوڵێل
سروودی نیشتیمانی ئەچڕێ
لەبەر لادانی ئاڵایەك لە فلیمێ
ئیعدام ئەکرێ



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆ دڵۆپێک** بووی وامزانی دەریای
تۆ دەریایەک بووی وامزانی دڵۆپەی
دەریا بی یا دڵۆپە بیت
هەردوکیانی
کێیە دەزانی تۆ لە کامیانی
ئەوە هەر منم
خۆم بە سووتانی ئاگر دەزانم
ئەوەی بسووتێ شارەزای گڕی گەرمی ئاگرە
ئەوەی تر تەنها بەفرێکی سڕە



www.iqra.ahlamontada.com

**جوانی تۆ** وەك ئاو وایە
کە هەڵئەڕژێ زەوی پڕ لە گیا ئەکات
وەك نوور وایە
کە داگیرسێ فەزا پڕ لە شەوق ئەکات
وەك با وایە
کە هەڵئەکا چی درەختە سەما ئەکا



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەوەندە** شیرین مەبە بتخۆن
ئەوەندەش تاڵ مەبە نەخورێی
ئەوەندە نەرم مەبە مانای شکانت لە بیرچێ
ئەوەندەش رەق مەبە، بەتیغی قسەیێ بشکێی
ئەوەندە شل مەبە با نەڕژێی
ئەوەندەش پەیت مەبە، بۆ ئەوین هەڵنەڕژێی
ئەوەندە بەرز مەبەوە با نەکەوی
ئەوەندەش نەوی مەنیشە
بە ئاسانی بەر تیری ڕاوچی بکەوی



www.iqra.ahlamontada.com

ئەمەوێ بنووسم
قەڵەمە جلەوكێش بەرەو تۆ
ئەمەوێ بگریەم
قەڵەمە فرمێسكی من بۆ تۆ
ئەمەوێ بچمەوە بناران
قەڵەمە ڕێگەی من بۆ لای تۆ
ئەمەوێ گۆرانی بڵێم
قەڵەمە وشەی من ئەباتە ماڵی تۆ
دەمەوێ ڕابكەم
قەڵەمە ئەمهێنێ بۆ لای تۆ
ئەمەوێ هاواركەم
قەڵەمە سەدام ئەهێنێ بۆ تۆ
ئێستاكە من دیلم
قەڵەمە زنجیرم ئەپسێنێ و ئەمهێنێ بۆ لای تۆ



www.iqra.ahlamontada.com

**ڕۆژەکان** چەند زوو دێن و ڕادەبرن
هاتنی تۆش چەند درەنگ



www.iqra.ahlamontada.com

**بەدیار** شەونمی سەر گیاکان وەستام
تۆ لە ناو تروسکەی هەموو شەونمەکاندابووی
نیوەڕۆیێ بە دیار لوتکەکانەوە وەستام
تۆ لەسەر هەموو لوتکەکانا بووی
ئەسرینت پێ هەڵدەڕشتم
ئێوارەیێ
بە دیار چەند تروسکێ لە ئاسو وەستام
تۆ لە ناو هەموو تروسکێکا بووی
دڵمت پڕ لە تاریکی ئەکردو جێتئەهێشتم



www.iqra.ahlamontada.com

**کتێبێ بووی** خوێندنەوەت مەستی ئەکردن
هەر شەوێ کەسێ لە بن باخەڵی خۆی ئەنا و
بەیانی بە کێوان ئەکەوت
ئەوەندە تۆیان خوێندەوە
هەموو جەرگت لەت لەت بوو بوو
هێندە خوێنی پەنجەکانت هەڵمژی بوو
دڵت هەمووی پەڕ پەڕ بوو بوو
ڕستەکانت هێندە درێژ بوون
هەر یەکێ بیخوێندبایەوە ئەگەیشتە قەڵای شارێ
وشەکانت هێندە پڕ چەمك و مانا بوون
هەر کەسێ لێکی دابایە دڵی پڕ لە عەشق ئەبوو
هێندە ئەو دەست و ئەو دەستیان پێ ئەکردی
تا دواجار ڕەشەبایێ
هەر پەڕێکی بۆ ناو جەنگەڵێکا بردی
کتێبێ بووی



www.iqra.ahlamontada.com

## تەمەنێکە

ئەتخۆمەوەو تینوێتی من هەر ناشکێ
تەمەنێکە هەموو شووشەی شەرابێکت
لێ پڕ ئەکەم ئەتخۆمەوە
تینوێتی من هەر ناشکێ
تەمەنێکە نان و زادت پێ ئەڕشێنم
برسیەتی من تەواو نابێ
تۆ ئاوی ئاو
سەدان ساڵە وەکو عەتر ئەتبەشمەوە
سەرم پڕ بەرامەت نابێ
گوڵەکانت پێ ئاو ئەدەم
تیغی سەختەندازەکانت بۆ ساو ئەدەم
بەڵام تۆ هەر پەیدا نابی
کارێزت بۆ ئەکەمەوە
هەرگیز بە سەرچاوەت ناگەم
جۆگە جۆگە بە دواتا دێم، کانی کانی بۆت ئەگەڕێم
تۆ لە کێی من ناتدۆزمەوە و
درەوشانەوەت تەواو نابێ
تۆ ئاوی ئاو هەزار ساڵە هەموو شەوێ
من خەونت پێوە ئەبینم



www.iqra.ahlamontada.com

کێوو دۆڵی سەرزەمینت بۆ ئەگەڕێم
پاشان ئەزانم سەرابی
کە جێت دێڵم لە دوورەوە
ئەڵێی تروسکەی شەرابی
تۆ ئاوی ئاو تەمەنێکە بانگت ئەکەم
هەرگیز وەڵام نادەیتەوە
ماڵم هەموو کردۆتە ئاو
کتێبەکانم پڕن لە ئاو
کتێبخانەکەم ئاو بردی
تۆ هەر وەڵام نادەیتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**لە بیرت کردم** وەك چۆن ئاو
سەرچاوەی خۆی لەبیر ئەکات
تا هەتا ناگەڕێتەوە
لەبیرت چوو ماهووتی شەوم لوول بدەی
بۆ ناو تیشکی سپێدانی ببەیتەوە؟
سێوی دڵم بخەیتە ناو سەبەتەیەك
بیخەیتە ناو باخەڵتەوە
یا شەونمی ڕژاوی هاوارەکانم
بە سەر پەلکە گیاکان کۆبکەیتەوە
لەبیرت چوو بەستەڵەکی هەناسەی من بتوێنییەوە
یا کتێبی هەزار ساڵەی شکایەتم بخوێنییەوە؟
درەختێکم هەتا دێ ئەچەمێمەوە
کەی دێی ڕەگی وشکەوە بووم، بڕوێنییەوە
هەزار ساڵە دەرگاکان ئەشکێنم و پەنجەرەکان ئەکەمەوە
بۆلای تیشکی جاویدانی تۆ ڕائەکەم
تادێ ئەدگاری ئەو تیشکەش
لەمن بەدوور ئەبێتەوە

**لە دارستاندا** شا لقێ هەیە



www.iqra.ahlamontada.com

ناوی من و تۆی لەسەر نووسراوە
لە نێو ئاسماندا سیوەیلێ هەیە
بە تەنها تۆی تیا ئەرەوشێتەوە
لە نێو بێدەنگی شەپۆلێ هەیە
داستانی خنکان ئەگێڕێتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**کچە** جوانەکە چەند مەستە
کتێبی ئاگاهی ئەخوێنێتەوە
کچە مەستەکە چەند نەرمە
شووشەی دڵی عاشق ئەبڕێ
کچە مەستەکە ئەگری، پێئەکەنێ
لەوەتەی هەیە
بەدیار گۆڕی خۆشەویستەکەی
گۆرانی ئەچڕێ و تەنبوور ئەژەنێ



www.iqra.ahlamontada.com

**بە دوای** درەختێکدا رامکرد
دارستانەکان لولیاندام
بە دوای شەپۆلێکدا ڕامکرد
دەریاکان قووتیاندام
بە دوای پڕوشەیەکدا ڕامکرد
ئاگردانەکان لوولیاندام
بە دوای ووشەیەکدا ڕامکرد
فەرهەنگەکان ونیاندام
بە دوای بنارەکاندا ڕامکرد
ڕەوەزەکان لوولیاندام
کە بە دوای تۆدا ڕامکرد
هەموو ڕێگاکان گرپیاندام



www.iqra.ahlamontada.com

## چی بکەین

ئەگەر لافاو هەڵسێ و ئاگر بگرێ

بەفر ببێتە سکڵی سوور

یاخود دڵمان تاریك دابێ

زمان پڕ بێ لە پەیڤی نوور



www.iqra.ahlamontada.com

**لەناو** زەنوێرو زناردا، لە منارەکانی ناو شاردا
لەناو زناك و زستاندا، بەسەر زیوەری چیاکاندا
بەسەر زامی گەرمی خاکدا
گۆرانی ئەوینت بۆ ئەچڕم ئەی نیشتیمان

**

لەناو منالانی گەڕەك، لەژێر مەشخەڵی تووڕەیی
لەناو مەینەتی ژیاندا، لەتەك ماڵە هەژارەکان
گۆرانی ئەوینت بۆ ئەچڕم ئەی نیشتیمان

**

بە بۆنی خۆڵی پیرۆزت، بەڕێژنەی خوێنی ڕژاوت
بە شەفەقی هەردوو چاوت، بە درەوشانەوەی هەتاوت
گۆرانی ئەوینت بۆ ئەچڕم ئەی نیشتیمان



www.iqra.ahlamontada.com

**کە چێت** وایە تۆ جوانترین کۆجیتۆی
ناو ئەم ژینە پڕ لە تەڵەی
ناڵێم هەڵەی
دڵنیابە ژیان پڕیەتی لە یەقین
بەڵام گومانیشی تیایە
لەوەتەی من تۆ ئەبینم خۆت لێرەیت و
سەرت لەو سەری دونیایە
چەند دوور ئەڕۆی



www.iqra.ahlamontada.com

**خوا** پەرستەکە ، لە خوا ئەترسێ
خەڵوەتی پەرستگا بەرنادا
خواپەرستەکە ڕۆژێ هەزاران جار، خۆی ئەشوا
تا بەهەشتی خوای بەرکەوێ ، خوا
بەڵام نازانێ ، بۆ تاقە جارێ
ئەو دڵە بچووکەی خۆی بشوا
چەند نەزانە ، ئەو خواپەرستە



www.iqra.ahlamontada.com

**یەکەم** کتێبم کردەوە
گەڵایەکی ووشکەوە بووی
درەختی ناو دارستانی گەڕەکی کورانی تیا بوو
دووەم کتێبم کردەوە
پەڕەگوڵێکی خەمگینی
بنەگوڵێکی دارستانەکەی ئۆردی تیا بوو
سێیەم کتێبم کردەوە
پەلکە لیمۆی گەڕەکی ناو قەسرانی تیا بوو
چوارەم کتێبم کردەوە
سێ چوار دڵۆپ فرمێسکی
ژێر دارتەلەکانی شەستی تیا بوو
پێنجەم کتێبم کردەوە
نامەیەکی لە هەزار جێ
بە جگەرە سووتاوی منی تیا بوو
شەشەم کتێبم کردەوە
وێنەیەکی ڕەش و سپی  تۆی تیا بوو
خودایە من ئازارم چەند جۆرە
هەر کتێبێ ئەیکەمەوە
مەلی یادێ لە فڕین لێوڕێژم ئەکا
چۆن ئەو هەموو کتێبە بخوێنمەوە؟



www.iqra.ahlamontada.com

**بەسەر** تاشەبەردی سپی بەرزاییەکاندا ئەوەستم
مەمکی گەرمی خۆر هەڵئەمژم
درەوشانەوەی ئەبەدی ئەبەشمەوە
ئەچمە ناو دڵی تەمتوومان
تریفەی سپی نوور بار ئەکەم
رووناهی بۆ خامۆشییەکان ئەبەمەوە
سەرێ لە داگیرسانی با ئەدەم
تا بلێسە بۆ ناو شەوی دوورو درێژی ژیان ببەم
دەچمە ناو ماڵی کۆترەکان
ئاڵتوونی گمە ئەهێنم
تا بتوانم لەناو جاویدانی شیعردا بمێنم



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆ چەند** دووری، نە با ئەگاتە ماڵەکەت
نە ڕێگایێ بەرەو تۆ دێ
تۆ چەند دووری نە دەنگ ئەگاتە ماڵەکەت
نە تەتەرێ پێت ئەزانێ
خۆتۆ هیچ باڵێکت نەبوو
ئەی چۆن گەیشتییە ئاسمان
ماسی نەبوویت، چۆن لە ژێر دەریاکان ژیای؟
ئێستاکەش بووی بە تەمتوومان
هەمیشە هاودەمی سپیی لوتکەی چیای



www.iqra.ahlamontada.com

**قوم قوم** شیری گەرمی ژیانم
لە کانی ئاسکەکان خواردەوە
شمشێر شمشێر ژەهری فیراق
هەڵئەڕژایە هەناومەوە
ڕێ ڕێ ئەچوونەوە سەر ئەو برینانەی
جەستەی کتێبیان پڕ کردبوو لە شەباقەی ئاڵ
هێستا جێ مابوو پاوان پاوان گیا بڕسکێ
دڵیان لە ناو میتاڵی خۆیان شاردەوە
ئاسکەکانیش رەوەز رەوەز
چرای جەستەیان داگیرسان
لە ناو زوڵمەتی دارستان
ڕێگەیان بۆ کتێبی برینداری من کردەوە
ئێستا دڵم پڕ بووە لە تیشکی چاوی ئاسکان
دەوروبەریش خاڵی بووە
لە بەزەیی ئەبەدی ئینسان



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەو ڕۆژەی** زەمانیان کلیل دا
جوانترین گۆرانی خۆی چڕی
کە باڵیان هەڵپاچی، جوانترین فڕین هەڵفڕی
کە چاویان کرد بە لانەی مێروو
خۆشترین خەونی خۆی بینی
کاتێکیش دڵیان بە تیر پێکا
ئاڵترین نەمامی ئەوینی، لە ناو سینەدا ڕسکا



www.iqra.ahlamontada.com

**عاشقەکە** بەیانیان ئەخواتەوە
سەرێ لە پارکەکان ئەدا
نیوەڕویان ئەخواتەوە
ئەچێتە لێواری رووبارەکان
عاشقەکە ، شەوانە ئەخواتەوە
سەرێ لە سەماخانەکان ئەدا
کە بەرەو ماڵ ئەبێتەوە
سەرێ لە گۆڕستانەکان ئەدا
کە ئەخەوێ ، خەون ئەبینێ
سەرێ لە بارەکان ئەدا



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەزانم هەی** لە نزیکمای، لەناو دەفتەرو کتێبمای
لەناو تاشەبەرد و گیاو گوڵی سەر ڕێگامای
گەڵای بەسەر درەختە بەرزەکانەوە
ئاوی لەناو کانی روون و خوڕەی گەرمی چەمانەوە
لە ناو سەرین و پێخەمای
نزیکتر لە دەماری ملمای
هەستت ئەکەم ، بۆنت دەکەم
سەراپا داگیرت کرووم
هەر بەوەشە من تاوەکو ئێستا زیندووم



www.iqra.ahlamontada.com

**كە** لە دەرگای شووشە ژەهراوییەکەی ژیاندا
هاتمە دەرەوە
هەموو شتەکان لەبەرچاوم شیرین بوون
بەرد گۆرانی بۆ زەوی ئەچڕی
خنکان لە ئاو نوقم بوو بوو
لوتکەکان سوژدەیان بۆ خەرەندەکان ئەبرد
مردووەکان نووسراوی سەرکێلەکانی خۆیان ئەخوێندەوە
نەمزانی ئەوە سەری خۆمە پڕلە زیوی شیعر بووە
**
کە لەدەرگای خەونە جوانەکەی ژیاندا چوومە ژوورەوە
هەموو شتەکان لەبەر چاوم ناشیرین بوون
بەرد سەری زەوی ئەشکاند
کەنار نەوڕەسی باڵ ئەکرد
خەرەندەکان لوتکەیان وردوخاش ئەکرد
زیندووەکان بە پاچی وەڕەسی
گۆڕیان بۆ خۆیان هەڵئەکەند
زانیم ئەوە سەری خۆمە
خاڵی بووە لە گەوهەری شیعر
`



www.iqra.ahlamontada.com

**نیشتیمانم** لەت لەت بووە، لەت لەت ئەبیت

لەتێ فارس ئەیجەڕبێنێ

لەتێ تورك ئەیگەوزێنێ

لەتێ عەرب ئەیڕەتێنێ

لەتێکیش شۆڕشگێڕەکانی خۆی ئەیگەوجێنێ

مەگەڕێوە بۆ نیشتیمان

نیشتیمانم لەت لەت بووە ، لەت لەت ئەبێت



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک** تەم دونیای سپی ئەکرد
وەك ئاوریشم لە قۆزاخە ئەکرایەوە
وەك ئاو هەڵئەڕژاو تاشەکانی ئەشووشتەوە
وەك با بەسەر پشتی ئەسپ هەڵیئەکرد
کە ڕۆیشت دونیا ڕەش داگەڕا
چرای زەمەن کوژایەوە
تۆ کێی؟ هەیبەتت سەر بە لوتکە نەوی ئەکا
ڕێگاکان لە ژێر پێت ئەلەرزن
ئاو لە ژێر قووڵایی سەد تەبەقەی زەمینەوە
بۆ لای تۆ هەڵدەقوڵێ و لە ناو لەپت ئەنیشتەوە؟
تۆ کێی؟ وەك شەراب مەستی ئەبەدت کردین
وەك شەپۆلێکی شەوقنار
بە ونبوونت
ئاوەها بوونت لێ تەنگ کردین
باس لە نووری ڕژاو ئەکەم



www.iqra.ahlamontada.com

**كە ئەهات** وەك پەيكی نادیار
دۆڵەكان پڕ ئەبوون لە بۆنی كتێب و
قەڵەمیش لە ڕستەی جاویدان
مەل سەمای ئەكردو گیاكان ئەڕسكان
ئاگری هەڵفڕین لە شاباڵ بەرئەبوو
تاشەبەرد لە تاوان شەق ئەبوو
زەمەن وەك بی ناو ئاو
ئەلەرزی لە ژێر پێی ئەسپەشێ
كە ئەهات جوانییەكان ڕەنگیان هەڵئەڕشت
بای مەستی ئەهات وبارانی شەرابیی دایئەكرد
كە ئەهات كچانیش ڕووت و قووت
لە تاوان یەكتریان هەڵئەمژت



www.iqra.ahlamontada.com

هەزار جۆرە وێنەت هەیە
منیش هەزاران تەماشا
وێنەیەکت لە ئاو ئەچێ
ئەزانم رۆژێ دێ ئەمخنکێنی
وێنەیەکت لە ئاگر ئەچێ
ئەزانم رۆژێ دێ ئەمسووتێنی
وێنەیەکت لە با ئەچێ
ئەزانم رۆژێ دێ هەڵمئەگری و ئەمفڕێنی
وێنەیەکت لە خاك ئەچێ
ئەزانم رۆژێ دێ لە باوەشم ئەگری
بۆ تا هەتا لەو باوەشە ئەمخەوێنی



www.iqra.ahlamontada.com

**پڵنگی** ڕەش لەناو تەمتوومانی سپی
وەکو شەو ڕائەشکا، وەك قەتران دایئەکرد
ئەوە پڵنگی بەختم بوو
بۆ ناو دڕك و داڵ ڕایئەکرد
بەرەو کۆتایی ئەبردم
پڵنگی سپی لە شەوستانی ڕەش
وەك بەفر ئەباری، وەك سەدەف ئەشکا
ئەوە پڵنگی بەختم بوو
دڵی پڕ شەفەق ئەکردم
بەسەر پشتی ئەسپی شیعر
بەرەو سەرەتای ئەبردم



www.iqra.ahlamontada.com

**چەپرەوەکە** لە مەیخانەکە دانیشتووە

بە دەستی ڕاستەی

یادەوەری خۆی ئەنووسێتەوە

چەپڕەوەکە نەخۆشە

سەرێ لە مەزارەکان ئەدا چاك بێتەوە

چەپڕەوەکە چاك نابێتەوە

ئاوی نووشتە ئەخواتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**هێند** هاوارم کرد تا دەنگم شکا
هەر پارچەیەکی بوو بە بروسکێ
بەسەر ئەژنۆی خۆم هەڵڕژایەوە
هێند نووسیمەوە تا پەنجەم شکا
هەرجومگەیەکی بوو بە کتێبێ
بە تەنها لە نێو کتێبخانەکەی خۆمدا مایەوە
بەردێکی زۆرم گرتە نەفامی
بەڵام بە تەنها بە سەر سەری خۆم کەوتە خوارەوە
ئێستاکەش هەروا بەرد ئەهاوێژم
بە دوای مانای بوون، بوونی ئینسانیم
هاوار ئەکەم و پەنجە ئەشکێنم
قەدەرم وایە هەرواش بکەم و هەرواش بمێنم



www.iqra.ahlamontada.com

**ژنە ڕەشەکە** هەمیشە ستیانی سپی لە مەمك ئەکا
ژنە ڕەشەکە چەند درێژە
هەمیشە تەنوورەی کورت لەبەر ئەکا
ژنە ڕەشەکە چەند تووڕەیە هەمیشە گۆرانی ئەڵێ
ژنە ڕەشەکە گەدایە
بەڵام تاجی پاشایەکان لە سەر ئەکا
ئای ژنە ڕەشەکە شاعیریکی چەند چاکە
هەمیشە چیرۆکی خراپ ئەنووسێ
ژنە ڕەشەکە بە قەتران خۆی ڕەش ئەکا
بۆ منیش حەزی لە کفنی سپییە
ژنە ڕەشە بەردەکە دڵی چەند نەرمە
ئاخ ژنە ڕەشەکە ئاگرە
هەر ئەڵێی ئاوە هەڵدەڕژێ
ژنە ڕەشەکە ئا ژنە ڕەشەکە



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەمەوێ** بێم دڵم بە گەڵم ناکەوێ
نیشتیمانم نازانم بۆ
تۆ وەك  نیشتیمانەکانی سەر زەوی نیت
نیشتیمانەکانی تر هەموو
بە عەشقی ڕۆڵەکانیەوە شوورە دراون
نیشتیمانم نازنم بۆ نەخشەت وەکو
نەخشەی  نیشتیمانەکانی تر نییە
نەخشەکانی تر هەموویان  لە ڕەنگێکا دارێژراون
بەڵام تۆ بەتەنهایت و ڕۆڵەکانت
فێری ئەو ماڵ و ئەو ماڵن
نەخشەکەی تۆ
ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆی لە دەست داوە
هەر کۆمەڵەو لە خەنەی ڕەنگی خۆی ناوە
ئاخ نیشتیمانم



www.iqra.ahlamontada.com

**من ئەمجا** دەستێکم هەیە، دەستی چەپان
ئەوە بۆ پەنجا ساڵ ئەچێ
خوێنی شیعرو بورکانی ئەوینی لێ هەڵئەچێ
نیوە شەوێ دەستی ڕاستم هەڵسایەوە
دەستی چەپی داگیر کردم
ئێستا ئەو دەستەم هەرچییەك ئەینووسێ
نە چەمکی هەیە نە مانا
نە جوانی جارانی ماوە
چونکە ڕۆحی شیعری زیندوو
لە نێو خوێنی دەستی چەپم بە جێماوە



www.iqra.ahlamontada.com

**بەسەر** بەرزترین لوتکەوە وەستام
سەیری رابردووی خۆمم کرد
هەمووی گڕو گڵپەو لەمپەرو تەقە بوو
هەمووی راکردن و  کەوتن
هەمووی ڕۆژگارێکی تاڵ و
هەمووی  تا سنووری مردن
خەیاڵم ڕەش ڕەش داگەڕا و
هاوارم کرد من چۆن ماوم ؟
بەڵام کە خۆم بەسەر لوتکەی
وەها بەرزی ژیان بینی
ڕێژنەی فرمێسکێکی ئاڵ
ڕووناهی هەتا هەتایی بەخشی بە گلێنەی چاوم



www.iqra.ahlamontada.com

**نە دەرگایەک** دائەخەیت و نە دەرگایەك ئەکەیتەوە
تۆ نە هەورێك ئەبارێنی و نە دەریایەك ئەهەڵمێنی
نە ئاوێك بۆ تینوێتیم هەڵئەپڕژێنی
نە ئەشکێ وشك ئەکەیتەوە
نە مەلی ڕوانینێکم ئازاد ئەکەی
نەتیرێك بۆ کوشتنی من لەکەوانی خۆت بەند ئەکەی
نە سووچێك لە تەنیاییم دائەگیرسێنی
نە هەناسەی ساردوسڕم خامۆش ئەکەی
تۆ چیت ئاوا کێشی ئەو ڕۆحەم لەنگ ئەکەی؟
ئەگەر بای، ئەوە با هەم گەڵا ئەوەرێنێ
هەم دارستان ئەڕسکێنێ، تۆ هیچیان نیت
ئەگەر خوای، ئەوە خوا هەم بەهەشت ئەکاتەوەو
هەم دۆزەخ دائەگیرسێنێ
تۆ هیچیان نیت، هەورە تریشقەی یا بروسکە
تۆ خەونی یاخود هەقیقەت
تۆ ئاگری یاخود لافاو؟
خەمگینیم ئەکەی بە سووتو
پۆلای دڵم ئەکەی بە ئاو بۆ لای خۆتم ئەبەیتەوە
تۆ چیت ؟
نەدەرگایەك دائەخەیت و نە دەرگایەك ئەکەیتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**بەسەر** کورسییەکەوە
لە ژێر شمشێرەکەی دیموکلیسا
کە بە تاڵەمووێك بەستراوەتەوە
ئەمەوێ شیعرێ بنووسم
درێژترین هاواری دونیا بێت
ئەگەرچی ئەزانم هاکا ئەپسێتە سەر گەردنمەوە
بەڵام ئەمەوێ شیعرێ بنووسم
خۆشترین ساتی دونیا بێت
ئەگەرچی هەردوو مەچەکم کۆتکراوە
بەڵام ئەمەوێ شیعرێ بنووسم
قووڵترین حوزنی دونیا بێت
هەرچەند کە ڕەنگە نەتوانم
بەڵام ئەمەوێ شیعرێ بنووسم
نامووسی کەون بڕژێنێ
لەژێر شمشێرەکەی دیمۆکلیسا شیعرێ ئەنووسم
خۆرەتاوێ ڕابخات و ئازادییێ بەرپا بکات
بەشی هەموو کۆیلەکانی زەوی بکات



www.iqra.ahlamontada.com

چەپکێ ڕۆحی شڵەژاوین
لەمێژە باڵمان شکاوە
میوانی خۆشەویستی بووین
کەس دەرگای لێ نەکردینەوە
ئاوازی جوانیمان ئەچڕی
هیچ کەسێ گوێی لێ نەگرتین
ناولەپمان پڕ پەپوولە بوو
لکە گیایەکمان شین نەبوو
سینەمان پڕ شەوبۆی هاوار بوو
سەدایەکمان نەبیستەوە
ئێستاش گەروومان نووساوە
چۆن دووبارە بفڕینەوە
کە باڵمان وردو خاش بووەو
چیای دەروونمان ڕووخاوە
دڵمان لە ناو گۆزەی شەو ئەدرەوشێتەوە
نیشتیمانیش
لە ناو گەرووی ئەبەدیدا قەتیس ماوە



www.iqra.ahlamontada.com

هەندێ جار مەست ئەبم
بە مەستی ئەگەمە دوا ترۆپکی ئاگام
لەویدا ئەکەومە نێو کێڵگەی پڕ شمشێری گومان
لەوێدا گەوهەری پڕ میهری جوانی تۆ ئەبینم
لەوێدا ئەگەمە سەر پشتی ئەو ئەسپە سورخنەی
کە بۆتە سەرمەشقی گریان و ئەوینم
لەوێدا ئەزانم ژیان وا بە ئاسانی ڕام ناکرێ
چەند دوور و بێ ئاگای
ئەبێ تۆ هەمیشە سەرزەمین تەی بکەی
ئەوساکە تۆزقاڵێ لە م کەونە تێئەگەی
لەوێدا ئەزانی تۆ چەند دەستەپاچە و بێئاگای



www.iqra.ahlamontada.com

**زۆرجار** قەڵەم لە ناو تەمتوومانی وشە
گیر ئەبێت و ڕۆحی ئەبێتە خۆڵەپۆك
هەندێ جاریش
لە ناو وەردی پڕ لە چەمکی وشەکاندا مەست ئەبێت
بۆ پەریسای دێرە شعرێکی ئەبەدی دێتە سەر چۆك
زۆرجار قەڵەم ئەکوژێتەوەو دانایی‌سێ
لە ناو کوانووی ماناکاندا
بە هیچ تەلەزمە ئاگرێ داناگیرسێ
بۆ گەیشتن بە باخی پڕ گەڵای مانا
تۆ ڕووناکی هەڵئەکەنی
ئەبێ هەتا ماوی بگری تا بۆ جارێ پێبکەنی
ئەی قەڵەم ئەی تریفە ڕێژی جاویدان



www.iqra.ahlamontada.com

ههڵا ههڵا من شهیدای ئهبهدییهتم
ئهبهدییهتیش کلیلێکه
له ناو قوفڵی مهحاڵ ژهنگی ههڵێناوه
قوفڵیش دیلی دهرگای هات و نههاته
دهرگاش بهندی چواچێوهیهکی پۆڵایه
پۆڵاش لهناو کورهی گڕی جوانی تۆدایه
تۆش وهکو ئهندێشهو ڕامان
که بۆلات دێم تۆ ئهگهیته تاقی ئاسمان
من شهیدای ئهبهدییهتم



www.iqra.ahlamontada.com

**کێ ئەتوانێ** خۆی لەخۆی بشارێتەوە
نە با ئەتوانێ گڤەی خۆی بشارێتەوە
نە ئاگر گڕوگڵپەی
نە مانگ ئەتوانێ تریفەی خۆی بشارێتەوە
نە شەو تاریکی
هەرچی هەیە لەم کەونەدا
سروشتی خۆی حوکمی ئەکات
کە مەحاڵە بێ ئەو سروشتە هەڵبکات



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەی شیعر** ، ئەی میهرەبان
ئەی پەرژین و باخی سیحر
گەر تۆ نەبای کێ ئاگری دڵی منی ئەکوژاندەوە
گەر تۆ نەبای کێ ڕۆحی پاك ئەکردمەوە
گەر تۆ نەبای چۆن ئەمتوانی لە گەڵ بادا قسە بکەم
نامە بۆ باران بنێرم، سڵاو لە پەپولان بکەم
گەر تۆ نەبای چۆن ئەبوومە خزمی گیا
چۆن ئەمتوانی لە ناو ماڵی ئاگر بنووم
یا لە گەڵ بەفر تەبا بم
لە کێ فێری سەما ئەبووم
پێم بڵێ گەر ئەتۆ نەبای من چی ئەبووم ؟



www.iqra.ahlamontada.com

**دەنگت** دەنگت، وەك بریسكەی بەر هەتاو
ئەپڕژێتە ناو خوێنمەوە
بیرەوەریت وەك وێنەی ئاو
جۆگە جۆگە هەڵئەڕژێتە ناو سەرمەوە
ئەو ئازارەی من ئەیچێژم
دەمار دەمار لە ناو جەستەما ئەگەڕێ
لەو كاتانەی تەیفی هەزار ڕەنگی تۆ
بەبەرچاوما وەك ڕەنگاڵە تێئەپەڕێ



www.iqra.ahlamontada.com

**دەنگی تۆ** وەك گۆرانییەکی کەونارو
پڕ لە تروسکەی ئەرخەوان
لەدوورەوە یەکجار دوور
دەنگی تۆ ئەمگاتێ
وەك بایێ بەسەر گیاوە هەڵبکات
یەك یەك وێنەی تۆم ئەداتێ
وەك شەبەنگی خەزان
تیشکی تۆ بەسەر دڵما دائەڕژێ
بەسەر پشتی بۆن و بەرامەی چیاکان
بەڕێگای پڕ جەستەی نیاکان
دەنگی تۆ بۆ لام دێ
کەی ئەگەی تا لانەت بۆ پڕکەم
لە مەرجانی شیعرو زەنوێری چیاکان



www.iqra.ahlamontada.com

**من دڵێکی** خەمبارم هەیە
بەڵام درەوشانەوە ئەنووسمەوە
تاریکی لوولی داوم
بەڵام خۆرەتاو ئەبەشمەوە
گیانم پڕە لە هاوار
بەڵام بێدەنگی زمانمە
گریانێکی هێجگار قووڵم لە ناخدایە
وەلێ ڕووخسارم هەمیشە
لە ناو بزەی ئەبەد دایە
ئازارێکی سەختم هەڵگرتووە
بەڵام هەمیشە
پەنام بۆشای هێمنی بردووە



www.iqra.ahlamontada.com

**ویستم** پشکۆ بکەم بە ملوانکەی ژیان
هەتا خوێنم گەرمتر بێ
ویستم باخێك بۆ شەرابی جاویدانی
لە کەناران هەڵێنمەوە
مەستی بکەم بە کتێبێ
بۆ هەمووانی بخوێنمەوە
قوم قوم ئاوم کۆکردەوە
تیشك تیشك ڕووناکیم لە هەتاو دزی
باوەش باوەش گەوهەری بن دەریام هێنا
بۆ هەر لایێ دەیان جۆگەی ئاوم هێنا
ڕێم لە ڕەوەزان کردەوە
قامك قامك پرچی تاریکیم هەڵپاچی
ئاردی خەمبارییەکانم بێژت
کەپەکی ماندووبوونم ڕێشت
بەڵام دواجار گەردوون بە تاو
منی لەناو زەمەن جێهێشت



www.iqra.ahlamontada.com

**وەک چۆن** ڕووبار بۆ هەر لایەکا هەڵڕژێ
هاژەی خۆی لەگەڵدایە
یا مەلەکان بۆ هەر لایەکا هەڵفڕن
جریوەیان لەسەر زمان
شەقەی باڵیان لە خوێندایە
تۆش وێنەکانت لە چاو و دەنگت لە گوێ
ناوت لە دڵ
بوونت لە نێو هەستم دایە
منیش ئاوا بۆ هەر سەرزەمینێ بچم
مشتێ خۆڵی نیشتیمانم
لەناو خەزنەی سینەدایە



www.iqra.ahlamontada.com

**کاتێ** که گیا
شەڵاڵمان ئەکاو عەتر ئەڕێژێ
خەون ئەبینم خەون ئەبینم
لەبەر ڕەشەباو کانگەی ڤیانم
لە سەختەندازی مان و نەمانم
هەمیشە بەتۆ خەون ئەبینم
ئەی نیشتیمانم



www.iqra.ahlamontada.com

**من به** پشكۆی ناو خۆڵەمێشی ژیان
كتێبی تاریكاییم ئەنووسییەوە
پڕوشكێكم كەوتە بەربای خوداوەندەكان
ریتمی شێوازی لەنگ كردم
پەنام بردە بەر لافاو
تا سۆراغی خەزنەی ئاگرم بۆ بكات
كە گەوهەری ڕۆحی شكاوی منی تیایە
لەو كاتەی هەر داڵەو
خوێناوی جگەری ئاگردز هەڵئەمژێ.



www.iqra.ahlamontada.com

بەڵام  با ئەوەندە خێرا بوو
گەوهەری منی بردەوە ناو زەریاکان
زەوی لەرزی و کۆسمۆس گۆڕا
بۆ ئەبەد تاقە مۆنادی خۆم نەدۆزییەوە
ئەی گۆرانییە خەمبارەکەم
ئەوە بۆ ئاوازت لەنگ بووە ؟
ڕووناکیت هەڵناچێ
تا دونیا پڕ لە شەوق بکەیت؟
سەرزەمین ڕێکبخەیتەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

**من له** هەموو لایەکا تەنهام
وەك دورگەیێ کە هەرچوار کەناری ئاو بێ
لە گەڵم بوونت، لە نزیکیت، لە دووریت
لە دڵما، لە چاوما، لە فیراق و لە سەبوریت
ئەی گەوهەری من ئەی ڕەنگ و خام



www.iqra.ahlamontada.com

**بەم شەوە** تاریك و toونە جێم مەهێڵە
بێ تۆ کیانم مردووە
ناتوانم بەرەو باڵا هەڵکشێم
بەرەو ناخم کە کتێبی خەمی دونیای هەڵگرتووە
ئەوەی با لە منی فڕاند قایغی شکاوی من بوو
نهێنی بوونم بوو
منی بەرەو ئاگردانی یەکەم ئەبردەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

**ئێستا** چیبکەم
چۆن بە پشکۆ تاریکایی بنووسمەوە؟
چۆن بە شەونمی سپێدان
مێژووی گیا بخوێنمەوە؟
بە قەڵەمی ئاگر لەسەر ئاو بنووسم
یا بە زرێی پووش
بچمە ناو مەلەکووتی ئاگر؟
لەوەتەی هەم من ئاوەها مەستم
تا بتوانم لەم زەوییەدا
بەسەر پێیەکان بوەستم؟.



www.iqra.ahlamontada.com

**عاشقەکەم** هەر نەهاتەوە
تاجی ئەوینم لەسەرکا
جارێ بڵێ ، جلە سوورەکەت فڕێ بدە
وەرە ڕۆحی من لەبەرکە



www.iqra.ahlamontada.com

**دوا جار** هەموومان
وەکو شەونمی سەر پەلکی مێخەك
بە بۆنێکی خۆش
باوەش بە کچی توانەوە ئەکەین
ئەبینە خۆڵ و شین ئەبینەوە وەکو ریسە گیا
مەست ئەبینەوە لەسەر باڵی با
فەزا بە کەونا ئەمانسورێنێ
ئەبینە تۆپی بەر پێی قەدەر
بەڵام چونکە من
جەستەم شەڵاڵی ئەوینت بووە
ڕامئەگرنەوە لە هەموو شوێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

شاعیرەکە ، کراسی سپی لە بەرە
باسی ڕۆمانی ڕەش ئەکا
شاعیرەکە هەموو سپییەکانی خۆشئەوێ
بە قەڵەمی ڕەش ئەنووسێ
شاعیرەکە ماڵی لەسەر دەریای ڕەشە
باسی کۆشکی سپی ئەکا
شاعیرەکە شیعری سپی ئەنووسێ
کتێبی ڕەش ئەخوێنتەوە
شاعیرەکە هیچی لە بیر نەماوە
ڕەش و سپی تێکەڵ ئەکات



www.iqra.ahlamontada.com

**له کۆڵانەکانی** پاریس باسی شەوبۆم
بۆ شانێل و سێوە بۆگەنەکانی بۆدلێر ئەکرد
کە هاملێت هاواری کرد
من زەویم پڕ گومان کردووە
کەچی یەقین ئەمکوژێ
چیتر باسی زەوی ناکەم بۆ گیا
کە گلەیی بەهاری بۆ پاییزی دڕندان ئەگێڕایەوە .



www.iqra.ahlamontada.com

**تۆش** وەك ئەو مارە ڕەشەی
گەردنی نیتشەی پڕ لە ژەهر کرد
گەردەنی منت پڕ لە ژەهر کرد
گوناه دەتکوژێ، رۆژێ دێیتەوە
پڕ بە دەمی خۆت
هەمان ئەو ژەهرە هەڵمژیتەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

**زۆر** دارستانی تاريك و توونم پێشێل كردووه
هەربۆیە پشتم وەکو کەوانم چەمیوەتەوه
هێندە نەرم و شل
شەختەی ئەوینی منی گرداوه
کلیل و قەفتەی
ژێی تیرهاوێژی خۆی ونکردووه.



www.iqra.ahlamontada.com

**شێوەکارەکە** هەموو ڕەنگەکانی ڕژاند
هەموو فرشەکانی شکاند
گەڕایەوە بۆ ناو چوارچێوەی تابلۆکان
لە  تابلۆکاندا نایەتە دەرەوە
لە ترسی ڕمان
شێوەکارەکە فرشەکانی توورِ هەڵدا
هاتەوە سەر قسەو زمان
ئێستاش ناتوانێ لە تابلۆکان بێتە دەرەوە
چونکە چەقیوە لە زەمان



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەمەن** بەردەوام
کەمەندی داغ و سفتی خۆی داوێ
بۆیە من ئەبێ دەست و دامێنی برووسك بگرم
نەوەك گەردنی کەنەفت و ماندووی منی بەرکەوێ
ئاخر من ڕاوچی هەورەتریشقەم
ئەوەی بیەوێ پەیکەری سەختی مەحاڵ ببینێ
ئەبێ بە شان و ملی ئەندێشەی قووڵدا سەرکەوێ



www.iqra.ahlamontada.com

**چاز چاز** لە هەوری ڕەشی قەدەرا
هەڵئەوەرێم و بەرئەبمەوە
دونیا پڕ برووسکەم بووە
هەژانی قووڵایی دەریام
بۆهەر لایێ بڕژێمەوە
هەمدیس بەرەو تۆ ئەبمەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

**لەهەزاران** هەزار کانی
من ئاوم بۆ تۆ هێناوە
لە ڕەوەزان بەفری لوتکەم
بۆ ئەوینی تۆ ساوداوە
ئاوم لە هات و نەهاتدا بۆ باخچەی تۆ ڕاکێشاوە
لە بەرد شوورەم بۆ هێناوی
هەزاران هەزار لەشکری
ئەو دڵەی خۆم بۆ قاوداوی
سەری پاشای ڕق و قینم بۆ پەلداوی
زەمیلەی گوڵی نارنجیم، لە لای خودا بۆ هێناوی
تۆش هەروەکو جارانی زوو
ئەو دڵەت کردووە بە مەشقی
هەمان تیرو هەمان کەوان



www.iqra.ahlamontada.com

**له بانیژەکە** هاتمە خوارەوە
لەقەراغ ئاوەکەوە
بە دیار بۆقەکانەوە وەستام
ئەوانیش بۆ ڕێزگرتن لە هاتنم
بوونە بەردی بن گۆم و
تۆزێ لە قیڕەیان وەستان
بۆ تاوێ سەیریان کردم
کە زانییان ئەمانێك نییە لای ئینسان
بازیان دایەوە ناو ئاو و تەنها مامەوە
خەمبارتر
لە گەڵای زەردو وەریوی ناو دارستان



www.iqra.ahlamontada.com

**چەند** حەسوودی بە بژی ئەو ئەسپە ئەبەم
کە با بە ناویا ئەسووڕێ و حیلە ئەبەخشێ بە خوێنیا
چەند حەسوودی بە باڵی ئەو مراویە ئەبەم
کە با لە ناویا ئەخەوێ وفڕین ئەبەخشێ بە ڕۆحیا
چەند حەسوودی بەو تەوارە سپییە ئەبەم
کە لە شەوی تاریك و توونی قەترانی
زمانی ئاگری گرتووەو
کەوتۆتە سەمای ئازادی و جاویدانی



www.iqra.ahlamontada.com

ئێمە ژیانمان لە بیر کردووە
یەکێ بەدیار دیمەنی دەریاوە ئەوستێ
ئەوەی تر لە سەیری سەمایەکی بالێ
ئەگەڕێتەوە بۆ ناخی خۆی
ئەویتر گۆرانی ئەچڕێ و ئەڵێ
خۆشەویستەکەم
بەیانی ئەچین بۆ کەنارییەکان
یا سبەی بە کۆمەڵ
ئەچین بۆ سەیری هاملێت
ئای ئێمە چەند لە ژیان بە دوور کەوتووینەتەوە؟
نا نا ئێمە ئەسڵەن ژیانمان لە بیرکردووە
ژیان لە کوێ ئێمە لە کوێ؟
هەتا تۆیش ئەی ژیان ئێمەت لە بیر کردووە
ئەفسووس ژیانیان لە بیر ئێمە بردۆتەوە
کەی ئەگەڕێینەوە بۆ ژیان کەی؟



www.iqra.ahlamontada.com

**سروشت** جوانی پێ بەخشیوی
وەرە تۆش دڵت ببەخشە من
منیش خۆم ئەبەخشم بە کانی
کانیش خۆی ئەبەخشێتە جۆبارێ
جۆباریش خۆی ئەبەخشێتە ڕووبارێ
ڕووباریش خۆی ئەبەخشێ بە دەریا
دەریاش خۆی ئەبەخشێ بە زەریا
ئا بەمجۆرە هەتا ماوین هەڵئەڕژێین
بەرەو هەموو سەر زەویەك ئەچینەوە
دواجار تێکەڵی
هەموو زەڕڕەیەکی ئەم وجودە ئەبینەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**كە ئەدوێی** وشەکانت ئەبن بە قەند

لەدەمی چیا ئەتوێنەوە

جۆبارەکان پڕ لە شەهدی هەنگوین ئەبن

پیتەکان ئەبن بە مرواری

لەناو دڵی تاریکی ئەدرەوشێنەوە

کە جوانیت تاوێر هەڵوەرێنێ

ئەبێ حاڵی دڵم چۆن بێت

تۆ هەمیشە بدوێ

تا جیهان سەرنخوون نەبێ

گورگی برسی لە سووڕی ژیان بەرنەبێ



www.iqra.ahlamontada.com

**که گەڕامەوە** تازە پەڕەسێلکە
چیلکەیان بۆ لانە ئەکێشایەوە
تازە دوا باران موژدەی گیای ئەدا بە زەوی
تازە ئاگر لە ئاگردان ئەکرایەوە
هاوارم کرد لێرە خۆرەتاو چەند گەشە
کەس وەڵامی نەدایەوە
زانیم نیشتیمان چۆل بووە
کاسەی ژیان پڕ خۆڵ بووە



www.iqra.ahlamontada.com

**بازنەیەک** ئەکێشم تۆ لە ناویای
بازنەیەکی تر وێنا ئەکەم تۆ لە ناویای
دوانی تر ، دەیانی تر، سەدانی تر
بەڵام ئاخ تۆ هەر لە ناویای
بازنەی یەکەم ئەکەمەوە تۆ ون ئەبی
بازنەی دووەم ئەکەمەوە وەك بەفر ئەتوێیتەوە
هی سێیەم ئەکەمەوە لە دەستم ڕائەکەی
من ئەبێ چەندین بازنەی تر بکەمەوە
تا دەستم لە تۆ گیر ببێ
ئەی ئەفسوونترین بازنەی بوون



www.iqra.ahlamontada.com

**كە** چوویتەوە بۆ دارستان
لەبیر نەکەی تەرمی سپی درەختەکان
ببیتەوە بۆ گۆڕستان



www.iqra.ahlamontada.com

**تاریکی** وەك مارێکی ڕەش

خۆی لە تەنهاییم لوول ئەدا

بیرم لە تۆ ئەکردەوە

تۆ وەك نوورو ئەستێرە بووی

ئەڕژایتە ناو دەروونمەوە

لەناو تەمتوومان و زریان

تۆ وەکو تیشك و سێبەر بووی

قاسەی تاریکیت ئەشکاند

ئەی شابالّی هەنگاو و هێز

ئەی پۆڵابەندو مەتەرێز

بەبزەی تۆ ئەستەم و سەختیم ئەگریاند



www.iqra.ahlamontada.com

**نە کتێبی** هەموو ڕۆژێ
بچمەوە ناو ڕەوەزی وشەکانت
نە ڕووباری خۆم لە ئاوی پیرۆزت بشۆمەوە
نە چیمەنی دەست لە ملی لکە گیاکانی تۆ بکەم
نە  خەونی سپێدان سەرم خامۆش بکەی
نە پەنجەرەی بەسەر دونیاما بڕوانی
لێم مەشارەوە ئەی شیعر ئەی ئانجیلۆ
وەک با وەک تەزوو وەک چیا لە من جودای
وا ڕووم لە ئاسمانان ئەکەم
لەقاپیت ئەپاڕێمەوە
گەورەم بۆت ئەنوشتێمەوە
چونکە ئەزانم
تۆ ئاسکێکی ئەفسانەی



www.iqra.ahlamontada.com

**لەدوور** دوورەوە سەیری خۆم ئەکەم
چۆن گڕی تەمەن
یەك یەك ڕۆژەکانم دائەگیرسێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

**شيعر** هەموو ڕەشی دونیا سپی ئەکا
شیعر ئاوی سوێری دەریا شیرین ئەکا
لەکەی قینی دڵی مرۆڤ ئەشواتەوە
مرۆڤ لەسەر پێ ڕائەگرێ
مردوو زیندوو ئەکاتەوە
بێزاری سەر ئەم زەمینە
لەبیر وجوود ئەباتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**من كه** زرێی شیعرم پۆشی
بۆ ئەوە بوو شمشێری زەمەن نەمبڕێ
بەڵام زرێی شیعر هێند گران بوو
لەنیوەی ڕێگە خستمی
باری دژواری شیعر بوو نەمری پێدام
بە هەمان شمشێر کوشتمی



www.iqra.ahlamontada.com

**له دەرگای** باكوورەوە بۆ لات دێم
تۆ دەرگای باشوور دائەخەی
بە سەر شوورەكانەوە بۆ لات دێم
تۆ شوورەكان بڵند ئەكەی
لە ژێر زەوییەوە بۆ لات دێم
تۆ دەرگای ئاسمان دائەخەی
بە ئاسمانەوە بۆ لات دێم
تۆ دەرگای زەوی دائەخەی
تۆ هەر دەرگاكان دائەخەی
منیش هەر كلیل دروست ئەكەم
ئێستا دڵی تۆ پڕە لە دەرگای داخراو
ماڵەكەی منیش پڕە لە كلیل



www.iqra.ahlamontada.com

**سەدان** ساڵ شەڕی ژیانم کرد نەکوژرام
بۆ ساتێ کەوتمە ناو جەنگی تۆوە
شمشێری ئاوینت پەلی دام



www.iqra.ahlamontada.com

**چوومەوە** ناو قەڵا دێرینەکان
خۆم شاردەوە
نە پەنجەرەیان هەبوو نە دەرگا
نەچرپەیێ ئەو ڕۆحەم بخاتە سەما
بیرم هاتەوە نەمزانی
بۆ هەر شوێنێ بچم وای لە دڵما



www.iqra.ahlamontada.com

**کۆتربازەکە** قەفەزی کۆترەکانی شکاند
کۆترە سپی و ڕەشەکانی ئازاد کرد
گەڕایەوە مەیدانی کۆتران
کۆترەکانی خۆی دۆزییەوە
لە ناو قەفەزێکی ترا ئەفرۆشران
کۆترەکانی خۆی کڕییەوە
هەمدیس بەرەلای ئاسمانی کردن
بۆ بەیانی لە قەفەسیانی بینییەوە
جارێکیدی ئازادی کردن
خۆی بووە دیلی ناو قەفەس هەتا مردن



www.iqra.ahlamontada.com

**زمان** به شەوقەوە تۆ ئەدۆزێتەوە
ئەم شەوقە هاواری دڵێکە
دڵێ لە قووڕی وەهم
ئەم وەهمە پڕە لە وێنەی جاویدانی
کە سەراپا بۆ من خوڵقاوە
ئەم خوڵقانە سەرەتای پیتی جوانییە
ئەو جوانییەی دەستی بە خوێنی شیعر سوورە



www.iqra.ahlamontada.com

**کەرەکەمە** دوور بکەومەوە دوور
بۆ دوورترین دەریاچە و چۆم
بۆ شوێنێ دەنگێکی لێ نێ
هەر بۆ ئەوەی تەنیا جاری بگەم بە خۆم
گوێ بدەمە لەرەی خوێنم
تۆزێ لای دڵی ماندووم دانیشم
سەربردەی خۆی بگێڕێتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**ماسیگرە** عەرەبەکە زمانی دەریا ئەزانێ
قسە لەگەڵ ماسی ئەکا
لە بەیانییەوە تا ئێوارە ماسییان ئەگرێ
بەرەلایان ئەکاتەوە
دوا جار قرشێ قووتی ئەدا



www.iqra.ahlamontada.com

**مەیفرۆش** بە تاقی تەنیا
لە ناو شووشەو قاپ و پەیمانەدا وەستا
شەلاڵی چریکە و ئاوازی مەیخۆرەکان بوو بوو
بیری کردەوە کە ئەو
چ بەهایێ ئەبەخشێ بەو خەڵکانە
بەهایێ ، مایەی مەست بوونی ئینسانە



www.iqra.ahlamontada.com

## کەرێکی سپی

لە پاوانێکی کەسکا ئەلەوەڕێ
لە کۆلێکی ڕەشا ئاو ئەخواتەوە
پیاوێکی جۆرەنگ ڕێشمەی ئەگرێ
سوورە ژنێ سەیری ئەکا
کەرێکی سپی بە ئاوازێکی خەمگین
گۆرانی خۆی ئەچڕی
تووشی نۆستالگیا بووە



www.iqra.ahlamontada.com

**خۆشنووسەکە** دڵی ئەلەرزێ
هەناسەی سوارە
ئەو ڕستانەی ئەینەخشێنێ
وەك شمشێری دەستی دۆڕاوەکان خوارە
خۆشنووسەکە هەموو جوانییەکانی نووسی
ئێستا باوەڕی نەماوە
دیلی تەنها تروسکەیەکی چاوە



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەمەوێ** بە شمشێرێکی شکاو
بە خوودەیەکی کون کون و
بە زرێ پۆشێکی ڕزیو
بە سواری ئەسپێکی کەرەندی تەپیو
بە لەشکرێکی هەزاران جار
لە شەبەیخوونی شەڕی تۆدا بەزیو
دیسان خۆم تەیار کەمەوە
دووبارە بۆ شەڕی جوانییەکانت بێمەوە
تا لە هێرشێکی ناگەهانی
هەموو تابۆکان ببەزێنم
تەواوی جەستەت داگیرکەم
لە ئاسێترین ئەشکەوتی مەملەکەتی تۆ
بارەگای خۆم بکەمەوە
گومەزەکانت بکەم بە مەزار
ئیمپراتۆرییەتی ئەوینم دامەزرێنم



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەمشەو** ئەمەوێ بە سەر پشتی قەڵەمێ
کەوتوو لە ئەزموونی بەکالۆریای ئەوین
جوانییەکانت لە قۆناغی ڕامانگیری
بگوازمەوە بۆ قۆناغی دامەنگیری
بە سەرپشتی بەلەمێکی شکاو
دەریای خرۆشاوی جەستەت تەی بکەم
تەلار تەلار، سەنگەر سەنگەر، داگیرت کەم
گرد بە گردی سینەت بگەوزێنم
ناچارت کەم
بورجی ئیفلی پڕ خوێنم کاڵ کەیتەوە
ئاوی جاویدانیم هەڵمژی
لە هەڵمەتێکی کت و پڕ
شمشێری پۆڵایینم زەلیل کەی
غروری خۆت ببەیتەوە
هەیبەتم شل و خاو کەیتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**ئێستە** جامی ئەیوبم پڕ بووە
شووشەی تەماشام شکاوە
تەونی لێکدانەوەم پچڕاوە
هیچ قەڵایێ
هیچ فیلێ
هیچ سەربازێکم نەماوە
تەخت و تاراج بەسەر سەری
ئەو مەلیکە خەمگینەیاندا ڕماوە
چواردەوری شەترەنج پڕ بووە
لە تەرم و خوێن
جووڵەکانت هێندە سووك و گورچك بڕ بوون
جگە لە هەڵکردنی ئاڵای سپی
هیچ چارەیێ بۆ شەبەیخوونی
لەشکری تارو ماری من نەماوە



www.iqra.ahlamontada.com

**جامی** بێداریم وورد و خاش بووه
ئەسپی هێمنیم شکاوه
دەمەوێ خۆم و لەشکرێ هەناسەی خێرا
خۆم و کۆمەڵێ خورپەی بریندار
خۆم و قەڵاو فیلەکانم کۆکەمەوه
له لێدوانێکی ڕۆژنامەنووسیدا
باسی شکستەکانی خۆم بکه
له هەوڵی داگیرکردنی تۆ
نهێنی بورجه سەختەکانی
سەر سینەت ئاشکراکەم
که بێ قۆشەن و بێ لەشکر
چۆن دەرونێکی بەزیویان
له ناو لەشکری مندا چاند
ئابلۆقەیان تارومار کردم
شمشێرەکەی منیان شکاند



www.iqra.ahlamontada.com

**لەبەر** ئەوەی هێندە حەزم لە دەریایە
هێندە حەزم لە لێوار و لە سەمایە
لەبەر ئەوەی هێندە حەزم لەچیمەن و
لە ڕوومەتی گوڵە گەنم و لە گەڵایە
هێندە حەزم
لە باران و خوڕەی ئاو و لە چیایە
بۆیە جگە لەو شتانە
من پێم وایە هەرچی تەختی پاشاو شایە
چی تەلاری هەزار قات و هەرچی شاژنی دنیایە
هەر هەموویان لە بەر چاوم
دەنگی تیژی ڕەشەبایە
ئای چەند گوناهم خودایە



www.iqra.ahlamontada.com

**له سه‌ر** چه‌ند به‌فرێكی چوارگۆشه‌ییم نووسی
تۆ منت خۆشده‌وێ ، به‌ڵام له توانه‌وه ئه‌ترسی
چونكه ئه‌زانی خۆشه‌ویستی
جگه له توانه‌وه شتێكی تر نییه
تۆش به قه‌ڵه‌مێكی به‌سته‌ڵه‌ك
له سه‌ر چه‌ند په‌ڵه ئاگرێكی هه‌میشه‌ییت نووسی
تۆ منت خۆش ئه‌وێ ، به‌ڵام له سووتان ئه‌ترسی
چونكه ئه‌زانی خۆشه‌ویستی
جگه له سووتان شتێكی تر نییه
قه‌ڵه‌می من له ئاگرستان هاتووه
قه‌ڵه‌می تۆ له به‌فرستان
ئه‌وینی تۆ توانه‌وه‌یه و
ئه‌وینی من سووتان
من به‌و قه‌ڵه‌مه كتێبی ئاگر ئه‌نووسمه‌وه
تۆش به‌و قه‌ڵه‌مه كتێبی ئاو ئه‌خوێنییه‌وه
كتێبی من پشكۆیه و ئه‌گه‌شێته‌وه
كتێبی تۆش شه‌پۆلان ئه‌به‌شێته‌وه



www.iqra.ahlamontada.com

**له هەموو** کتێبێ
که یەکەم ووشەی لێ ئەچنم
ئەڵێم تەواو جارێکی دی
نایەمەوە ناو ماڵی تۆ
له هەموو ڕووبارێ
که شەپۆلێکی داگیر ئەکەم
ئەڵێم تەواو جارێکی دی نایەمەوەکەناری تۆ
له هەموو چیمەنێک
لکە گیایەکی بۆن ئەکەم
ئەڵێم تەواو جارێکی دی
نایەمەوە ناو سەوزاییت
له هەموو خەونێکا
که وێنەیەکت ڕاڤە ئەکەم
ئەڵێم تەواو جارێکی دی
ناچمەوە ناو تەیمانی شەو
له هەموو پەنجەریەیێ که شنەیەکت ڕاو ئەکەم
ئەڵێم تەواو جارێکی دی نایەمەوە ناو شوشەکەت
بەڵام کاتێ یەک دوو قەترە
له شەرابی ئەوینی تۆ ئەخۆمەوە
ئەڵێم بۆ ئەبەد ناچمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

**که پێکەوەین** لە ژێر پارچە ئاسمانێکی ئەم دونیایە

سەر زەوی پڕ لە ئاو ئەبێ

گیا لەسەر تاشە بەردەکان شین ئەبێ

ڕووبار نەرم نەرم ئەڕوا

زەمەن ئەبێتە فڕفڕۆك

ڕۆژهەڵدێت و لەچرکەیەك ئاوا ئەبێ

ڕەوەزەکان هەموو ئەبن بە مەیخانە

ساقی نوقمی سەما ئەبێ

شەرابی سوور ئەخورێتەوە

زمانی قسە نامینێ

تای ئەوین جێی ئەگرێتەوە

که پێکەوەین



www.iqra.ahlamontada.com

**تووشی** زۆر ئاگری هار بووم و نەسووتام
تووشی زۆر لافاوی دژوار بووم و نەخنکام
ڕەشەبای زۆر بە تین لە درەختی ڕۆحم ئالاوە
بەڵام هەر نەشکام
خەنجەری ژەهراوی زمانی زۆر کەسان
لە پشتم چەقیوەو نەڕمام
بەڵام تۆ نە گڕی بمسووتێنی
نە لافاوی بمخنکێنی
نە ڕەشەبای بەسەرما هەڵبکەی
نە ژەهری تا ژەهراویم بکەی
کەچی بە ئەوینت سووتام و هەم خنکام
بە شمشێری تیژی فیراقت کەوتم و هەم شکام



www.iqra.ahlamontada.com

**ئەڵێی** بازی نووری هەڵداوە
لەسەری خۆی نیشتۆتەوە
وەها نوقمی درەوشانەوە بووە
جیاوازی لەگەڵ خۆر نەماوە
چۆن بێم بۆ لات
کە هەردوو چاوم لەبەر تیشکی تۆ گیراوە
چۆن باوەشت پیا بکەم
نزیکت ببمەوە ئەسووتێم
تازە لەگەڵ خۆر تێکەوتووم
جگە لە سووتان هیچ بوارێکم نەماوە



www.iqra.ahlamontada.com

**بۆن** و بەرامەی تۆ نەبێ
کوا نیشتیمان ئەناسمەوە
شوێنپێیکانی تۆ نەبێ
کوا بە ڕێگا ئەکەومەوە
ڕێگاکانت پڕ کردووە لە ئاو
جێپەنجەکانی تۆ نەبێ
هیچ کتێبێ ناناسمەوە
کتێبەکانت پڕ لە ئاگر کردووە



www.iqra.ahlamontada.com

**هه‌تا** هه‌تا من شه‌یدای ئه‌به‌دییه‌تم
ئه‌به‌دییه‌تیش کلیلێکه
له ناو قوفڵی مه‌حاڵ ژه‌نگی هه‌ڵێناوه
قوفڵیش دیلی ده‌رگای هات و نه‌هاته
ده‌رگاش به‌ندی چواچێوه‌یه‌کی پۆڵایه
پۆڵاش له‌ناو کوره‌ی گڕی جوانی تۆدایه
تۆش وه‌کو ئه‌ندێشه‌و ڕامان
که بۆلات دێم تۆ ئه‌گه‌یته تاقی ئاسمان
من شه‌یدای ئه‌به‌دییه‌تم



www.iqra.ahlamontada.com

1

شووشەیێ شەرابی شینی ڕووت

پەیمانەم لێورڕێژی ئەزەلی با ئەکات

تەوقی گەردنی من زیوینەو هەناسە ئەبەخشێ

بە تیغی دوو دەمی نەمانم

هەندێجار شەوقی تۆ ئەبێتە شمشێرو

بیناییم لە جوانی لەت ئەکات

بۆنێکە لە باخچەی داگیرسان

شیعرم لە تریفەی ناو گۆزەی شەو ئەکات

مەینەتبارە ڕەژووی ئەو دڵەم

لە کوورەی ئەوینت بۆتە ئەڵماسی شین

لە ساتێ مەست بووە  کە شەراب لەمێژە

لە  پەیمانەی منا خەست بووە



www.iqra.ahlamontada.com

## 2

که سەمایێ لە ناو لەپی با هەڵئەکا

وەك ئەوەی کە دەریا لە باوەشتا بمرێ

وەستانی زەمەنە بەسەر شەختەی ساردی جودایی

نایەڵێ گریانم تەواو کەم

تەمێك دێت ڕستەی شیعرم لە تاوان زەرد ئەبێ

ناتوانێ چرکەیەك رایبدا

ئەوەستم وێنەی تۆ وەها دەورم ئەدا

تەیمانی زمانم ئەڕووخێ

ئەیبینم نایبینم تارمایی کراسێ ئەپۆشێ و

ئەکەومە ناو دڵی وڕێنە

وەهمێکە ژیانم دائەگرێ و

دەرگایێ لە سەرم نامینێ جارێ بکرێتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

3

من سەمای شیعرم هەڵبەستووە
لە تونێلی سەخت و ڕەوەزی زیویندا
ئەبەدیم ڕاوکردوە بێ پەروا قەفەزم
وەك کۆتێ لە ملی ئازادی دادڕێ
لە پاوانی کەسکی ئەویندا
بێتۆییم کردۆتە قەراری زمانم
چەند سەختە ئەوینت ببێتە تەوتەمی
پەرستگای پڕ تیری نەمانم
ئەچمەوە ناو دێرو کوختەکان
هەتا دێم حەقیقەت ببەخشە بە باخی گومانم



www.iqra.ahlamontada.com

4

تەنهایی پەیمانەی شەرابی سپێدەی شکاندووم
تریفەی شیعری لێ هەڵڕشتووم
ماندووم و هەمیشە ڕائەکەم تا بگەم
بە زناری سپی کەمەر و ماچی کەم
داگیرسانێك لە دڵ بەربووە
عەوداڵی تاریکیم نایگەمێ ڕووناکیم بداتێ
تیشکی تۆ چەند گەشە بینایی لێ سەندووم
ئێستا بێ بینایی ڕەوەزان تەی ئەکەم
مەودایێ ببەخشە بۆ ساتێ بتوانم
چاوی خۆم بۆ وێنەت بکەمەوە
چڵە گیایێ لە چیمەنی ئەدگارت
بۆ ماڵی بیابانیم ببەمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

5

له دڵی ئاگردا خۆڵەمێش دیارە و

له دڵی ئاویشدا وشکایی

له شووشەی زەویدا قووڵایی

له پۆڵای دڵی تۆش شەرابی جودایی

له مندا دڵۆپێ

خۆڵەمێش ڕۆحی تۆی له تەم گرواندووە

من له تۆ تۆ له من ئەوینی بەخشندەو

نەمامی هەزاران نهێنیت چاندووە

خاك لەتاو هاتنت وشك هەڵگەڕاوە

له نێو تەمتوومانی زەمەندا دڵی تۆش

پەیمانە وردووخاش بوو

له ژێر تاسەی گڕی شەرابدا

ئاوەهاش دڵی من



www.iqra.ahlamontada.com

6

تەونێکت لە زنجیر چنیوە بۆ ڕۆحم
فڕینی شلکردووم بۆ مەرگ
تیغێکت لە ئەڵماس ساوداوە بۆ ملم
کوشتنی ئاوداوە بۆ دڵم
شەوێکی درێژە سەرتاپای ڕێگەشم گیراوە
وا ئەڕژێ  چۆڕاوگەی برینم
ئەی شیعر دەروازەی مەرجانی ناخی خۆت
بۆ قەڵەم هەڵڕێژە
بتوانم سەفایێ داڕێژم
کەون پاك کاتەوە بۆبەر پێی بینینم



www.iqra.ahlamontada.com

7

ئەو خوێنەم پڕ بووە لە سکڵی جوانیت
سووتانی خۆشکردووم
کانیلەی چاومی پڕ دەریا کردووە
لافاوە بۆ ناو ڕێی خنکانم
من ئێستا لە ژێر تیشکی زێڕکفتا
مەلێکم مەبەستە بەسەرما ڕابووڕێ
نە قەڵەم لە دەستم گیر ئەبێ و نە دڵم
لە ناو زێی ئەوینت پیر ئەبێ
دوا قەترەی تەنهاییم وەك ئاڵتوون
ئەڕژێتە سەر زەوی غەریبی
هاتووم و دەرگایێ نابینم
کرانەوەی بە دوابێ ئەی مەحاڵ



www.iqra.ahlamontada.com

8

چراکەت داگیرسان دڵی من بەو شەوقە گڕی گرت

لەمێژە توایمەوە

شەوقێکە ئەوینت زەیتی ناو دەماری خوێنییەتی

ئەسپی دڵ تاو ئەدا

تا هەتاش ئەو دڵەم بەو گڕە بسووتێ

هێشتاکە ناگاتە گەشی ڕووت

هەربۆیەش چی ڕستەی شیعر هەن

لە زمانی بەرزیی مانادا دەناڵێ

چی بکەم من تا شەوقی ئەو گڕە

ئازادیم بۆ بکا بە هێزی شاباڵێ؟



www.iqra.ahlamontada.com

9

دوو باڵم لە باخی مەلستان بۆ مەستیم هێنا بوو
تا پێم لە سارای خاك بێتەوە
دوو دیدگام لە شووشەی دڵی ماسییەکاندا هێنا بوو
قووڵایی جوانیت ببینم
دوو دەستم لە لۆکەی تەمتوومان هێنا بوو
بیکەمە سەرینی ئەبەدی گەردنی ئاوینت
دوو داوە تیشکم لە ناو ماڵی خۆرەتاو دزی بوو
بیبەخشم بە شەوقی ڕوخسارت
دوا جاریش ئاوازی ئازادیم هێنا بوو بۆ قەفەس
داگیرسێم لە شەوقی دیدارت



www.iqra.ahlamontada.com

10

ئاوێکی  سامگرتووی منیش مەلەوانێکی ترسنۆک

ئەمەوێ بگەمە لێوارت بۆ ساتێ

گرێکی بێ ترس و تەنکی

منیش دوو شابالّی تەنکتر

ئەمەوێ بچمە ناو بلێسەت

بەفرێکی ئەستوورو چەمێکی بە خوڕڕی

منیش ئەشقێکی گڕگرتوو

ئەترسم بێمە ناو دلّتەوە بی بە ئاو

هەلّڕژێی یەکجاری نەتبینم



www.iqra.ahlamontada.com

## 11

تا ئێستاش دەنگەکان هەروا دێن دەنگی تۆن

لە تاوێرو تاشەکاندا ئەزرنگێنەوە

تا ئێستاش ڕەنگەکان هەروا دێن

ڕەنگی تۆ لە گیادا ئەپڕژێن

ئەوە دەنگانە سەدای جوانییەکانی کەونە

لە شەبەنگی تۆدا خەست بوونەتەوە

ڕەنگەکان تیشکی هەموو دارستانەکانە

شەڵاڵ بە ئەدگاری تۆ بووینە

بۆیە من لە هەموو دەنگێکا ئەکەوم و

لە هەموو ڕەنگێکا زیندوو ئەبمەوە



www.iqra.ahlamontada.com

12

نە شکا توایەوە ئێستاکە ئاوازە

ئینجانەی دڵم بوو کەوتە بەر ڕووناکی و

تەبەشی بەیاتریس توایەوە

ئەوەتا بارانی توانەوەی دڵی من

لافاوی خستە ناو ئۆقیانووس

ئەوینی جاویدانی دڵی تواوەی من

بۆتە پەلکی زەیتوونی ناو دەنووکی مەلان

هەر بۆیەش ئەو چریکەی ئەیبیستی

چریکەی ئەوینە ئەخوێنێ

کەون پڕ ئاوازی تۆ بووە

ئاوازێ تا هەتا لە گەرووی ئاشقان ئەمێنێ



www.iqra.ahlamontada.com

## 13

درەنگە درەنگ سێ بەتڵی شەو راشکاوە
بەڵام تۆ هەر لە ناو چاوما ئەدرەوشێیتەوە
بە هەزاران ڕەنگ دەورەدراوم
دڵم پڕ مەلی ڕەنگاوڕەنگی سپێدانە
هەستم ئەکرد پەنجەکانم بوونەتە فرشە و
هەرچۆنێ ئەموەشاند
دەفتەریان پڕ لە ڕەنگ ئەکرد
ڕەوە ڕەوە شەوی نووتەك و شەوەزەنگ
لە ناو لەپی مندا ئەمرد
بەیان ئەنگووت
بەڵام لەبەر تیشك و تاوی ڕوخساری تۆ
هەستم بە زەمەن نەئەکرد



www.iqra.ahlamontada.com

## 14

تۆ لە کوێی تەوتەمی سارای دوور؟
ئەی خوناو لەسەر پەلکی گیا
ئەی ڕستەی ئەبەدی
ناو شیعرو تەمتوومان
ئەی شیرازەی هەبوون بەم هەموو جوانییەوە
چۆن وابکەم تۆ تیشکی خەونم بی
چۆن توانیت لەبەرگی گەڵایی یا بریقەی خوناو
تروسکەی شەونم بی
لە کام ئاو کام دەریا وەستاوی
بوونم وا کەوتۆتە تۆفانی لەرزەوە؟
دڵمت وا داوەتە دەست تەرزە
تای ئەوینم نەبێ لەمێژە بوومەتە چلوورە
ئەزانم ڕووناکیت ئەمکاتە ئاوی جاویدانی
زێ بە زێ ئەڕژێمە چاوتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

## 15

کەی ئەگەی کەنار لەبەر پێتا ببێتە ئاڵتوون

ئاڵتونیش لە تاوتا بتوێتەوە

زەوییەکان چاوەڕێی بەخششی تۆ ئەکەن

بەخششت چەتری بەر بارانی ژاڵەیە

کەی ئەگەی چیاکان گفتوگۆی بنارو

ئاڵەکۆکی ژێر بەفری تۆ ئەکەن

کەی ئەگەی ئەفسوونت ببێتە ئەفیونی ئەبەدی و

ئاگاهیم لێ سەنێت؟

ئەزانم کە ئەگەی

بوومەتە فەرشی ڕەنگماتی بەری پێت کەی ئەگەی؟



www.iqra.ahlamontada.com

## 16

وەك بەفر بوو دڵم ڕەشبۆوە

وەك پەری ئەبەنووس بوو سەرم سپی بوو

شارێك بووم لە تەلاری بەرز بووم بەگوند

ئاگرێکی گەش بووم ئێستاکە خۆڵەمێش

دەریا بووم شەپۆلم ئەگەییە ئاسمان و بووم بە گۆم

پاپۆڕی گەوهەر بووم نوقم بووم

تۆهاتی دڵ سپی هەڵگەڕاو سەر بوو بە نیلۆفەڕ

گوندم بوو بە شارو خۆڵەمێش بوو بە نوور

چیت هێنا لە گەڵ خۆت وا کەینوونەت گۆڕیم

کتێبی ئەندێشەت پڕکردم لە ڕستەی جاویدان؟



www.iqra.ahlamontada.com

## 17

بمتوانیایە لە ناو ماڵی ئاودا بژیم

هەموو دونیات بۆ ئەگەڕام

من سیمای تۆ ئەناسمەوە

بمتوانیایە لە ناو لەپی تیشك بژیم

تیشکی دونیام ئەهێنا بۆت

بەڵام هەرچی با هەیە وا لە ناو دڵی مندا ئەژیت

بۆیە دڵم پڕە لە تۆ

هەرچی تیشك و ڕووناکییە

لە ناو گیای شیعری مندا دێت و دەچێت

تۆ نە چەپکەنە ئەکرێیت

تا لە ئینجانەی خوێنمدا جاویدانیت پێ ببەخشم

نە ئەتوانم لە باوەشی خۆمت گرم

بۆ تا هەتا لە سینەما بەندت بکەم



www.iqra.ahlamontada.com

## 18

تازە چەم ڕژاوە بۆنی خاك بە سینەم پژاوە

تەیمانی ئەوینمی تەنیوە و جامی دڵ شکاوە

ئۆلۆمپی دەستی تۆ

منیشی کردۆتە مەشخەڵ و

سووتانم ئاسمانی لە نووتەك بڕیوە

هاتووم و زۆر سەختی و ڕەوەزم خستۆتە ژێر پام و

نوقمی وێنەت بوویمە

چەند سەختە تا ئەگەم

وێنەت لە بای گەردوون بگۆڕێ و بیت بە ئاو

چەند ئاوان بگەڕێم بە دوای تۆ؟

کە سێ بەشی بوون هەر ئاوە



www.iqra.ahlamontada.com

19

تێپەڕین بە سەرما باڵداری سەوزی تۆ
کە لە ئاوی چاوم شوران و باڵیان گرت
هەڵوەرین لە ناخی درەختی ئەشقی تۆ
کە لە کێڵگەی سینەم ڕووابوون بە ئاوی فرمێسکم
بێت و تا ئەتبینم کتێبی برینم دانەخرێ
چیمەنێ لە جوانیت ئەنووسم
ڕستەی هیچ شیعرێکم نەتوانێ زیندوو بێ و
هاڵاو نەیسووتێنێ
ئیدی با تێپەڕن نە ئاسمان ئەبینم
نە درەختی سەوزی ئەشقی تۆ



www.iqra.ahlamontada.com

20

ئەوینە تاجی دڵ نەخشەکاو

دڵی بەردیش نەرم و تاریکی شەق ئەکا

باخچەی خوێن پڕ کەروێشکی سپی و

باڵۆرەی وجودیش پڕ نەوای نەی ئەکا

بێ ئەوین جوڵەی بازنەی کەون تێکئەچێ

کەس کێشی نامینێ

ئەوینی تۆ وەها منی لە قاف ناوە

پێموایە من چاوم هەرنییە لە شەوقت ڕامینێ

ئەی کلیلی بوونم بەبێ تۆ

قفڵێکی ژەنگاوی و بوونێکی زەبوونم



www.iqra.ahlamontada.com

له جووڵەی بازنەیی کەوندا ئەوینت
بناغە و ڕەزمی ڕاز و  بوونە
ئەوینی تۆیە کە ئەتوانم
تەڵەسمی بایەکان بکەمەوەو
نهێنی و قووڵایی ببینم
ئەوینی تۆیە کە ڕەنگ ئەدا بە شەوق و
شەوق ئەدا بە چراویلکەی ژینم
تۆ دەنگی زەمین و بڕبڕەی هەبوونی
بە ئەوین منت لە خاچگەلی خۆت داوە
کەی دەمێ مەودایەك ئەبەخشی
تا منیش بۆ تاوێ بەرپێی خۆم ببینم؟



www.iqra.ahlamontada.com

22

دوا جار بوو بەسەر پشتی تیشك و ڕووناكی

گلێنەت لێسەندم نەمتوانی بتبینم

ئێستاكەش ئەو تیشكە چاومی گرتووە و

بە تەنها لە شووشەی سەرمدا دیاری

لە دوای تۆ وەك مشتێ خۆڵەمێش

هەر بایێ هەڵئەكا تۆزێكیم لێئەباو

زەوی پڕ من بووە

دواجاریش لە كەلێن و درزی زەویدا

بۆ ئەبەد لە بووندا نامێنم

بەم تیشكەش تۆڵەی خۆم

لە تاریكی و بێتۆیی ئەسێنم



www.iqra.ahlamontada.com

## 23

چەند ماندووم هەر ئەڵێی بۆ ئەوە خوڵقاوم

هەمیشە بە دوای تۆ ڕابکەم

ئێستاکەش لە دڵی ڕاکردن ڕائەکەم

ڕاکردن پیشەمە بۆ ئەوە خوڵقاوم

ڕاکردن بە دوای تۆ وچانی ئەبەدیی و

تا هەتا تەوقی سەر گەردنمە

کەی ئەگەی شمشێری ڕاکردن

بخەمەوە کاڵان و لەگەڵ تۆ با بگرم

کام مردن ماوە من نەیچێژم؟

ئەوەتا دوا مردن لەبەرما ڕائەکا



www.iqra.ahlamontada.com

## 24

وەرەوە زەمەنم وەستاوە فەلەکم ناسووڕێ

ئەوەندە نەماوە بکەوم

لە کام با هەڵئەکەی دێمە بەر ئەو بایە

لەمێژە دژ بە مەرگ وەستاوم

ئەوینت وا لە ناو خوێنمدا ڕسکاوە

کەسێکم وەك ئەوەی کە زەمەن لە تەلبەندی ناوە

بۆ ساتێ وچان دەو وچانت سروشتم ئەگۆڕێ و

ئەبمەوە خودی خۆم

ئەو منەم بدەوە

من بەرگەی بەرداشی با ناگرم

تا هەتا بسووڕێم



www.iqra.ahlamontada.com

25

کاتماڵێکی تەنگ و ناخۆشە

من لە کات ڕائەکەم

دەرەوەی کاتەکان ماڵمە

شوێن شەرابێکی تاڵ و سەنگینە

شوێنەکان جێدێڵم دەرەوەی شوێن ئاڵە

کات و شوێن بۆ ئەوین ناگونجێن

ئەوین کەی ئەتوانێ

لە بنباڵی شوێنکات هەڵبکات

ئەو مەلە شاباڵی خۆی هەیە بێ فڕین ئەکەوێ

پەڕوپۆی ئەسووتێ

چی بکەم تا بتوانم دەرەوەی کاتوشوێن

بکەم بە ماڵی خۆم فەزای تۆ بدوێنم؟



www.iqra.ahlamontada.com

## 26

مەڵەی من لە ئاوی خوێ نییە
لە دەریای ئەڤینی ئاویندا بڕستی گرتووە
بۆ ساتێ دەستم لە شەپۆلی کێویدا گیر ببێ
قایغی ئەوینم لە باخی تەمتوومان پیر ئەبێ
ئەوینە تان و پۆی ئەم کەونە
بێ ئەوین کەی قەرەج
لە سوچێکی زەوی بێ چڕین گیر ئەبێ
ساڤیو تۆ لە کوێی
خەریکە شاباڵی مەڵەی ئەبەدیم
لە سفت و ڕەقی ئاو شل ئەبێ؟
وەرەوە ڤێرژیلم بمبەوە لای پەیاتریس
کە دوور لە فلۆرانس وەك دانتی خەمگینم



www.iqra.ahlamontada.com

27

دیار بی یاخود نادیار

له بەرزایی بی یا له بنار

هەر له ماڵی ئاوی سپی گلێنەمی

چەشنی دەمار نەزمی دڵمت له دەستایه و

فەلەکم هەڵئەسووڕێنێ

زۆر کەڕەتان به نێو ڕێگەو بانەکاندا ئەڕۆم

ئەوه خۆم نیم ساڤیو ئەتۆم

لەمێژه خۆم لەدەست داوه

ونێکی ئەبەدیم و تۆ هاتوویته ناو جەستەی من

ئەوین هێزێکی جاویدو گروەنکاره

ئەویندارانن له یەك ئەداو ئەیکا به یەك



www.iqra.ahlamontada.com

## 28

که سەیری پەنجەکانم ئەکەم
قەڵەم بە سەر کاغەز دادێنن
پەنجەکان تۆن ئەیانناسمەوە
که چڕینێ بە گوڕ ئەمگرێ
دەنگەکان هەمووی تۆن
زمان پڕ شیر ئەکەن
زمان تۆی
وەها بە ناو خوێنما هەڵئەفڕی
هەست بە شاباڵی جوانیت ئەکەم
ئاسمان تۆی
لەم فەزایە بەرینەدا بە سەر مەداری دڵمەوە
ئەبەدێکی بۆ تا هەتا لە هات و چۆی



www.iqra.ahlamontada.com

## 29

له گه‌ڕان به دوای تۆدا
شوێن پێمه زه‌وی ته‌نیوه
بوونه‌ته كانیله‌ی ئاوه‌كان
وێنه‌ی تۆیان لێ ئه‌دره‌وشێته‌وه و
دونیایان پڕ نوور كردووه
سیمای تۆ هه‌ر وه‌ك ته‌متوومان
كه‌ونی له تارای سپیدا
له زنجیری ئاقیق گرتووه
له‌وه‌ته‌ی هه‌م ته‌وقی گه‌ردنم ئه‌شكێنم
مرواریت له خوێن به‌ربووه‌و
به‌نێو كه‌وندا وه‌ربووه
دڵی من گۆشت نییه پۆڵایه
مه‌گه‌ر نا تیزابی فیراق چۆن
تا ئێسته نه‌یسووتاندووه؟



www.iqra.ahlamontada.com

## 30

بروسكێكی دووره جارجاره له قووڵایی دڵما
ئه‌بێته چه‌خماخه‌و تاو ئه‌دا
شه‌باقه‌ی برینه له باخی مێلاقه‌ی سووورباودا
بۆته كوانووی تیشك و مۆری سه‌ر بازوان
جۆگه‌یێ شیری ئه‌وینه
به ناو گیانی ماندووما
دائه‌ڕژێ و هه‌ستی من ساو ئه‌دا
وردووخاشبوونێكه جار جاره
به‌رئه‌بێته گیانی گه‌وهه‌رسای ئێسقانم
ئه‌وه تۆی بروسك و شكست و برینی زه‌ینم
پڕ بلاچه‌ی نوور ئه‌كه‌ی



www.iqra.ahlamontada.com

## 31

شاهەنگی ئەوینت شیلەی دڵمی مژی و
ئێستاکە دڵی من کەوتووەو دڵێکی کوژراوە
گەوهەری یەکدانەی ئەوینت
وەك سوولی دامێنان
شاباڵت منی پڕ لە فڕین کردووە
زمانم پڕ ئاوازی زەردوسوور بووە و ن
زیکیم نەماوە دوورییە ئومێدم
ئەی باخی پەلکە گیا و ئاقیقی هەزار ڕەنگ
ناو چاوم جێهێڵە بەدیت کەم
ئەگینا کوێرێکم لەبەرپای بێ سنوور
شاباڵی فڕینت ئاراستەی من ئەکا



www.iqra.ahlamontada.com

## 32

که‌ده‌نگی شكاوی شووشویێ ئه‌بیستم
ئه‌ودڵه‌م پێم ئه‌ڵێ که‌چه‌ندین هه‌زارجار
وه‌کو ئه‌و شكاوه‌
ئه‌و كاته‌ی گه‌ڵایێ له‌ به‌رزایی ئاسماندا ئه‌وه‌رێ
ئه‌زانم شاباڵم ئاوه‌ها له‌ فڕین ئه‌كه‌وێ
كه‌ ده‌نگی گریانێ له‌ ئه‌وین ئه‌بیستم
ئه‌زانم شیعری من له‌به‌رچی هه‌میشه‌ گریاوه‌
هه‌ربۆیه‌ش ده‌نگی نه‌ی له‌ داخی ڕه‌نگی به‌ی
چوارده‌وری به‌ فیراق گیراوه‌
دڵه‌كه‌م شكان و شاباڵم
سووتان و ئه‌وین و گریانت به‌ چه‌شنێ
له‌ خاچی بێئه‌وی دراوه‌
كه‌ ته‌نها تاقانه‌ی زه‌مین بم
نه‌ له‌ كه‌س بچم و نه‌ كه‌سیش له‌ من بچێ



www.iqra.ahlamontada.com

## 33

ژێی دەنگم هاواری ونبوونت پساندی و

سپێنەی چاوانیش گەڕانم بە دوای تۆ ڕەشاندی

پەنجەکانم پۆڵای نووسین بوون

هاڵاوی ئەوینت وەراندی و

خوێنیشم فیراقت لەوتاندی

پەیمانەم کریستاڵی زیوین بوو و تووڕەییت

لە پێکی دواییندا بە هێزی ئێستەتیك شکاندی

ئەوێستاش تەنهام وتەنهاتر لەباخێ

کە تەرزە لە شەوێکی تووشا

ئەوەندەی لێمژی ژاکاندی

ئەوەستم بۆ ئەوەی تێبگەم

ئەو دڵەی کە پڕ لە ئەوینە چۆن ماوە

لە نێو تای ئەم ژینە؟



www.iqra.ahlamontada.com

## 34

چەند کپیت لە ناڵەوهاوارم

چەند سپیت لە گلارەی چاوانم

چەند ئاوییت لە بیابانی دڵم

چەندگەرمیت لەسینەی ساردما و

چەند ونیت لەلوتکەی دیارو

چەند شەوقیت لە شەوی تارما

ناولەپم کردە تەختی زیوی هەمایۆن

بۆ تۆی شاو گەردنم بۆ کردی بەکاڵان

بۆ شمشێری دەستت

ڕێگەی هات و نەهاتم بڕی لە پێشوازیت

ئاوی دەریای سوێرم خواردەوە

ئەوەتا بینایی شکاوم

دەرگای پۆڵای داخراوم

کلیلیش لە سینەت شەوقێکە

بریقەی ئەچێتە ئاسمان



www.iqra.ahlamontada.com

35

من تینوو، ئاوی تۆ ئاگر بوو

من زەوی بینینت ئاسمان بوو

گەڵا بووم هاتنت پاییز بوو

وشکایی گەوهەر بووم تۆ زێی دوور

من کاسەی بەتاڵی زەمان بووم

تۆ شەرابی کۆنی سەد ساڵە

لە بازنەی زەمەندا سووڕانم دیارترین بڕیار بوو

تۆ شەوقی بە ورشەی نادیار

لەمندا هەمیشە هاتن و لە تۆدا هەمیشە راکردن

من بەرزاییم بۆ ئەبڕیت تۆ دامێنت تەی ئەکرد

ئەوێستاش سوارێکم زینی ئەسپی جوانیم

لە تاریکی ڕۆچووە

تۆ لە ناو ڕووناکی تاو ئەدەی



www.iqra.ahlamontada.com

## 36

تا هەبم ئەوینە ستوونی هەبوونم راگرێ و
نەبوونم ساتێکە کە ئەوینم ئەمرێ
دڵخۆشم بە مردن لەو کاتە
بێ ئەوین
نەورەسێ نافڕێ و
قەڵەمێ ناپشکوێ و
شنەیێ هەڵناکا
ئای کە ترسناکە
ئەبینی منی شێت لە تۆدا چەند زیندووم
لە بێتۆیی مردووم
هەر بۆیەش هەمیشە ڕائەکەم
ئەو کاتە گەوهەری شیعرو شین ئەبێتە خۆڵەمێش
کە ئاگر نامینێ و دڵەکان بە تاڵن لە شەوق و بلێسە
بۆیەکا من گۆرانی ئەچڕم
ئەزانم چڕینم بۆ چییەو بۆ کێیە
کە خەزنەی ئەوینم لە وێیە



www.iqra.ahlamontada.com

37

با هەر شەو لە قژتا تاریك بێ و

ڕێ بە سەر باڵاتا باریك بێ

لێ سەمای شیعر هەر جاویدە

کە شەوقی ئەوینی لە دڵ بێ و

هەمیشە لە ئاوی ئەویندا شینی شەوبۆ بگرێ

من لە ناو ڕەوەزو لوتکەدا ئەوینم ئاوداوە

لە ڕێی دوور و دەریا هاوارم لە دەمت ساو داوە

هیچ دوندێ نەماوە

لەوێوە سەیری تۆم نەکردبێ

لەمپەرێ نەماوە

لە بەر پێی هاتنم بۆ لای تۆ نەمردبێ

زۆرجاران تاشەی دەم بناران

لە بەر پێم گڕ ئەگرن ئەمناسن

لە تاوی ئەوینم ئەتاسێن

چەند خۆشە کەوتن و نوقم بوون لە تۆدا

یا گەیشتن بەوەی کە شیعر

لە وێوە نەمری بە تۆدا



www.iqra.ahlamontada.com

38

ئەبینی ئەم بایە چەند سەخت و سەنگینە
ئەزانێ تۆ لە کوێی بۆلای تۆ هەڵئەکا
ئەوە دێت
ئەو ڕۆحەی پێیەتی هی منە وەریگرەو
دەفتەری ئازارە ناردوومە
لە میانی من و با هەزاران باوەش لە نهێنی
نێوانی پڕ لە خزمایەتی کردووە
لە میانی من و با ئەوین و ڤیانی تۆیە
لە فەزای بەند کردووین
من و با چەند شێتین ئەوینی تۆ نەبا
لە ئۆقیانووسی خەم ئەمردین



www.iqra.ahlamontada.com

39

ئەوەتا خاك و هەڵۆ لە نێو تای ئەویندا کەوتووەو
تەمە سسپییەکانی لە ڕۆحدا شین بوو
بۆتە پیانۆی گەشی ڕۆژهەڵات
بۆتە پەنجەی دۆستێ
هەمیشە چاوەڕوانی تۆ ئەکات
لە ژێر درەختی سەوزی حیکمەتدا
من بورجی بەلەکی زەمین و زەمانم نووسیوە
درەختێ جارجارە وەك ئاقیق ئەدرەو شێتەوە و
جارجارەش وەك دڵم خامۆشە
لە کتێبی ئاودا توامەوەو
ڕژامە ناو کتێبی ئاڵی نەی
مێژووی ئەوینم نووسییەوە
کە سکڵی ناو خۆڵەمێشم داگیرساند
چوومەوە بەرزایی بەرز تا قووڵایی
ئەبینی ئەوینت چۆن داگیری کردووم؟



www.iqra.ahlamontada.com

40

تەونی پڕ نەخشی ئەوینت

بینایی لە من سەندۆتەوە

تا من ئەم نەخشەم تەواو کردووە

هەزاران گەڵای سیحراوی شیعرم لێ هەڵوەریوە و

هەزاران شانەم لە سەردا مردووە

تەونی ڤینی تۆ وەك کێوی قافە

نە تەواو ئەبێ تا وێنای ببینم

نە دەستیش پێی ئەگا

هەزاران هەزار سیمورغی ڕۆحم ڕێیان گرتووە

بەڵام تا ئەبەد ناگەن بەو ڕێیە

دڵنیام کەوا هەرگیزاو هەرگیز ڕێ تەواو نابێ

بۆیە پێویستم بە سەدان دڵە



www.iqra.ahlamontada.com

## 41

زمانم پڕ بووە لە مەلی ئەوین و

داغستانی ڕۆحم پڕ بووە

لە تەرمی سەدەیەك وەرینم

ناو لەپم لە گیای سپێدەت نوقم بوو

دڵیشم لە تاوی فیراقت بە ساردی زوقم بوو

زۆر دوورو دێرینە

من لە شووشەی شەوقی تۆوەیە

چۆلەکەی هاوارم ئاسمانی تەنیوە

کە زێ دێ ئەزانم ئەوە تۆی وا هاتووی

بمخەیتە بەر شەپۆلی تاسەو هەڵئەکەی

وا کەنار پڕ ئەبێ لە نەوڕەس

ئەزانم ئەوە تۆی کە نایەیت

تا چرای مەرگی من پێبکەی



www.iqra.ahlamontada.com

42

تەمتوومان دوندو دامێنی داگرتبێ

ئەوە تۆی وەك ستوونی شووشە

کەونی ڕاگرتبێ

لە تەك هەر تاشەیێ گیایێ ڕوابێ

ئەوە تۆی ئەوە تۆی بەوێ تێپەڕیبێ

تۆ لە گەڵ شەونم و باو بۆران و

ڕەزی شەراب و ئاوەکان هاودەمی

بۆیە من سەراپای وەرزەکان تەی ئەکەم

تا دەستم بتگاتێ

وەلێ زوو ئەبیتە چەم و ئاو

تۆ ئەی تاقانەی گەردوون و

گەوهەری یەکدانە و ئاقیقی شین و مۆر

لێگەڕێ بۆ جارێ بتبینم

بۆ ئەبەد چاوانم لێکبنێم

ئەی تەوقی مەرجانیی گەردنم



www.iqra.ahlamontada.com

## 43

ئەوەی من ئەینووسم

لە سەر ئاویش نەخشی خۆی هەیە

لە باو بۆرانیش دائەگیرسێ

ئەوین شوێنپێی هەیە و شابالی هەبوونە

بە ئەوین ژین پڕ مەرکانەی بوون ئەبێ

کە میهرو ڤیانی تۆم هەبێ

کوانووی شەوقی ژین ئەبەد ناکوژێتەوە

ئەبینی ئەوین مەشخەڵێکی چەند کۆن و دێرینە

ئەوینە وا ئەکات هەر نوێ بێتەوە

ئەوەی من ئەینووسم

لە کانگەی ئەویندا هەڵئەقووڵێ و

ئەزەلە وشك نابێتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

## 44

پەنجەرەکەت بکەرەوە با جوانیت با بیبات و

زەوی پڕ لە عەتری ئەزەلی سیمات بێت

با دڵم بەو عەترە پڕ لە تای ئاگری ئەوین بێت

لاولاوەی شیعری جاویدانی لێ شین بێت

دەنگی تۆیە بانگی ئازادی و سەرچاوەی ڕەهایی

بە تۆیە تاشە بەرد گوڵ ئەگرێ

ڕەنگی تۆیە تابلۆی دەریاکان شین ئەکا

هەور پڕ لە شەوبۆی شین ئەکات

پە نجەرەت بکەرەوە

با سپێدە پڕ ڕەنگی چاوت بێ

سینەشت پڕ لە گیا



www.iqra.ahlamontada.com

## 45

وەرەوە لەمێژە بەسەر ئەو تاشەوە وەستاوم

بوومەتە پەیکەری بەر باران

وەستانم بای سەخت و شەڕی تووشی بەفرو

سووتانی زەمانەی بینیوە

لافاوی تا ئاسمان بەرز بوو و

بوومەلەرزەی تا قووڵایی زەوی و مردنی بینیوە

هەست ئەکەم بە ڕاستی بوومەتە تاشەیێ

لەو تاشە بەردانەی دەوروبەر

هەر تەواو من بەردو پەیکەری بەردینم

ئەگینا چۆن ماوم تا ئێستا نەمردووم؟



www.iqra.ahlamontada.com

## 46

ڕێگاکان  لەبەر پێم دوورو درێژ ئەبنەوە

هەمیشە تۆش ئاوا دوورو درێژ ئەبییەوە

بۆیە من بە درێژایی هەموو وەرزەکان لە ڕێگام

ڕێگایێ نەماوە من تەیم نەکردبێ

ئەبینی ئەوینت منی چۆن کردۆتە تەمنشین و

تەنهاییم تەوقی ژین ؟

هەتا چاو هەتەرکات

تۆ دووری و دووریشت

بە تەنها هەر بۆ لای من نییە

لە هەموو لایەکا هەر دووری و دووریەکانت

منی لە هەزار لا گرتووە



www.iqra.ahlamontada.com

47

ئەی تەم و تەمتوومان

دیارو نادیار

زەمین ئاسمان

رەوەزو دەریای دوور

لە هەر لاو کەنارێ

لە هەر لوتکەیەك و دامێن و بنارێ دیاری هەر بۆیەش

من ئەبێ ببم بە هەزار بەش

دیسانەو هەر بەشی تۆ ناکەم

ئەوینی ئەوینان منی داگرتووە

مەحاڵە بتوانم لە شوێنێ داگیرسێم

بزانە سووتان لە ناو گڕی ئەوینی ئەبەدی

چەند سەختە دەبێ خوێن بەباکەم



www.iqra.ahlamontada.com

48

ئێستاکە لە نێو بای هەزار لا دانیشتووم
بەڵام دڵ بەتەنها یەك ڕووگە ئەبینێ
ڕووگەیێ تۆی تیادا بە درێژایی هەموو چاخەکان
وەك مەشخەڵ ئەمینێ
مێزەکان ، خێدان و دارووچکەی بنددان، قاپی مەی
هەموویان لە سەمای بادانە
سەمای باش لە لەپی تۆوەیە و ئەوینتە
کە بای خستۆتە سەماوە



www.iqra.ahlamontada.com

49

هەندێ ئاوازم بە شاباڵی سووری بازێکا ناردووە
تاوێر لە خۆشی خۆی لەقئەکا
دڵنیام  لە شەقەی باڵێکا ئەگەنە لای تۆوە
وەك لاولاو لە کەمەرت دەئاڵێن
ئەو ئاوازانە بەم هەیبەتەوە
ئەوینی منیان تیا نووسراوە و پڕپڕن لە گریان
لە گەڵ هەر هاژەو هەر خووڕەیێ
بەڵاتا ئەڕژێن و بازووبەندی زەمەن شەق ئەکەن
ئەم ئاوازانە هی منن
بەڵام لە ئاوێنەی هەزاران شەوقی  تۆن



www.iqra.ahlamontada.com

## 50

له ئاوی زوڵاڵی ناو دڵی شەونمدا تۆم دیوە

چاوم پڕ لە نووری تۆ بووە

لە خەونی شەوانی زۆر تاریك تۆم دیوەو

دڵم پڕ نارنجی حەسرەت و ژان بووە

لە تیشکی هەتاودا سەمای تۆ

کتێبی فێربوونی چوونە ناو ئاگرو ژەنینی ژێی گڕە

ئەوینێ دیمەنی وای تیا بێ ئەویندار

چۆن لە ناو باخی بلێسەی تۆ مابێ

من کوشتەی ئەوینێکی وەها دژوارم

هەر بۆیەش بۆ ئەبەد ئەمبینی خەمبارم



www.iqra.ahlamontada.com

## 51

ئەمەیان دوا ڕستەو دوا دێڕو دوا وشەو دوا پیتە
بەواندا ئەچمە ناو تەنووری ئەوینت
سەرەتا بە خەون و بە وەهم و بە خەیاڵ
من قسە بۆ هاڵاوی ئاگرو سکڵی گەش ئەکەم
پاشانیش  بە ڕستەی درێژو بە دێڕی ڕووناهی
بە وشەی ناو تیشك و بە پیتی سیحراوی
دوا جاریش بەو دڵەی ئەیکەمە قوربانی
بەو جەستەی ئەیکەمە خواردنی مەرگی تووش
ئەوساکە منم جاویدانی لە ناو باخی شیعر
ئەی بوون و نەبوونم
کەی ئەگەی؟



www.iqra.ahlamontada.com

## سەرزەمینی سووتاو

کەس نەیدەزانی لە کوێوە ئاو بۆ ناو قەڵای دمدم ئەچوو، نهێنییەك بوو، تەنها گەورەکانی ناو قەڵاکە ئەیانزانی، کەچی دوژمن هەرزوو سەرچاوەی ئاوەکەی کوێر کردەوە، ئەرێ کێ بوو ئەو نهێتییەی گەیاندە دوژمن؟



www.iqra.ahlamontada.com

1

قاشوانێ

چەند خەمگینە سترانی پاییز،

ئاوازی  یاقووتی بیرەوەرین

پڕە لە گەڵای ئەو جەستانەی لە پێناوی خۆر هەڵوەرین

فرمێسکی ئاگرین لە چاوی کوێر ئەوەرێنێ

کانی غوربەت لە قووڵترین بیابانی ڕۆح ئەتەقێنێ

سەبری ئەبەدی و پڕ لە سوێی ئەیوب

لە دڵی وێرانی یاکووب ئەتارێنێ

هەزارەها بیری خەیاڵ بۆ یوسفە عاشقەکان  لێئەدات و

جلی سروشت شەلاڵی خەون و خوێن ئەکات

تا هەر گورگەو بەبۆنی خوێن داڕزێت و بلورێنێ

چەند خەمگینە سترانی پاییز- دوایی نایێ دادم دادت -

لەدوا برگەی ئەو گۆرانییە بوو

لە دامێنی ڕەشباوی سورداش

بە خانیم گووت ئێمە کە - سوخەن نەوازێکمان - نەبوو



www.iqra.ahlamontada.com

ئەدی بۆچی خوا ئەو زمانەی بە ئێمە بەخشی
وتی ئاخر کەسەر پڕبوو لە تەونی جاڵجاڵۆکە
زمان لە گۆئەکەوێ
ئێمە کۆمەڵە درەختێکی شکاوین کەڕەشەبا هات
خۆمان دەرگای دارستانمان بۆکردەوە
خانای لەپ زێڕین دمدمی
لە سەر بەرزترین چیا هەڵێنابوو
کە کچەکانی دمدمێ یەك یەك خۆیان لەقەڵا هەڵدەدێرا
هاواری ئەکرد هەزار هێندە بەرزبینەوە هەر ئەوەرین
دەمی داس و کلکی تەورین
بۆ خاك ترسنۆکترینین
بۆ یەکتریش ئەڵێی بەورین
لە کوێی فەرهاد ئەی خەمگینترین کوڵنگ وەشێن



www.iqra.ahlamontada.com

که پڕووشە ئاگری کوڵنگەکەت
جەرگی بێستوونی کون کون ئەکرد
بە دوای رۆشنایی ونبووی،
ئەگەر ئەمجارە چوویەوە سەر گاشەبەردەکانی بێستوون
بە ئەشکەوتەکان بڵێ حەیفێ، ئەمن شیرین ئەبینمەوە
نە دوانزە سوارەی مەریوان
ئەگەنەوە پێیتەختی میری بابان
ئەوە ژەهری کوشندەی چ تیرە مارێکە
هیبارینی خوێنی ئێمەی سڕ کردووە؟
دواجار کە نالی خانەقای بەرقەڵای جێهێشت
لەو لاپەڕە رەشنووسانەی جێماویدا نووسیبووی
سەرت لە گومەزەکەی خانەقا ئەکا
- لایێ پڕە لە مەشعەلە، لایێ پڕە لە مەشغەلە -
تۆ چۆن ماوی؟



www.iqra.ahlamontada.com

2

بەهاری دڕندان

هاوین بوو سوارەکانی دەوروبەری قەڵای مێردین
ئەو قەڵایەی سەری لە تەوقی ئاسمان و بنی لە
دەریاچەی وان بوو
کە خۆرەتاو لە تاق و پەنجەرەکانی ئەدا
رۆژهەڵاتییان پڕ لە نووری خودا ئەکرد
دەرودیوارو خشتە زێڕینەکانی لە ژێر تریفەی
مانگەشەودا
وەك یاقووتی شکاوی بەر تیشکی هەتاو
هەزارن هەزار تریسکەیان هەبوو
هەر خشتەی بە دەستی خانزادێ داڕێژرا بوو
هەر ڕێبوارێ بەوێدا تێپەڕ ئەبوو
هەر بۆ خاتری تەماشا
حەوت شەو حەوت ڕۆژ لەوێ ئەمایەوە
بۆنی بخووردی سەردیوارە ئارمووشییەکانی
ئەگەیشتەوە مەریوان، تا ئەو سەری گردی سەیوان



www.iqra.ahlamontada.com

که حاجی به سەر منارەی قەڵاوە هاواری ئەکرد
- هێندە صورەت زۆر بووە، مەعنا لە بەینا ونبووە-
من تەواو لە دوا بەندەری شێتی بووم و هاوارم ئەکرد
بۆنی تەرمی بۆتان ئەکەم لە ناو دەریاچەی دۆکاندا
بۆنی شەبەیخوونی سوارەکان ئەکەم
لە ناو دارستانی ئەلوەتان دا
ئەو کاتە لە مەیدانی چوارچرادا قاشوانێ
بە سەری قەددیسەکان ئەکراو
گۆی سەری نەهری ئەپەڕییە ناو ئاسنگەرەکانی دەرسیم
گۆی سەری شێخی دەرسیمیش
ئەپەڕییە ناو قەڵاکەی ئاربیلا
چەند سەختە سترانی پاییز کەبا هەڵئەکات
بۆنی تەرمە بێسەرەکان
ئەگەیەنێتە هەرچوار ئەقلیمی دونیا
ئەم ئێوارەیە قەرارە هەموومان
بچینەوە بەر دەرگی سەرا



www.iqra.ahlamontada.com

بەیەکەوە گۆرانی بۆ دایکی وەتەن بڵێینەوە
خوێنی جەستەمان چکی کردوو
فرمێسك چاویش وشك بوو
نەمانتوانی تاجە بە خوێنەکەی میدیا بهێنینەوە
هاوار بکەین سەفەرتان بەخێر سەفەرتان بەخێر
قوڵینگە ناوەختەکانی گەرمێن
ئێمەش خاچەکەی ئێوەمان هەڵگرتووە و ب
ەرەو نادیار ڕێکەوتووین.
کەوتووینەتە ناو خەرەندی مێژوو و ئەهەڕمێین



www.iqra.ahlamontada.com

3

پەیکەری دزراو

دوای ئەوەی لە میخ و زنجیریان دابوو

هاواری ئەکرد

ئەو کەسەی بیرەوە ڕەت بوو

بەرەو ماڵی هەتاو ئەچوو

باوەشی پڕ بوو لە قەڵەم

دڵی پڕ بوو لە ئاگر، سەری پڕ بوو لە مەشخەڵ

ئەوە لەو کاتەدا بوو کە خاتوو مێرێ بەسەر پشتی

ئەسپە سپییەکەوە بوو

بەرەو مەنزڵگای شەهادەت

تارتارۆسی جێئەهێشت

لوورەی گورگە بۆرەکانی ناو دۆڵ و شاخەکان

ئەوناوەیان شەلاڵی ترسێکی ئەبەدی کردبوو

لەدوور دوورەوە بانگی ئۆرفیوسم کرد

کەمێکی تر سێتارەکەت لەدەریا وردوخاش ئەبێت

ئەو ئەسپە ڕۆحی جاویدانی باوکی پشکۆیە



www.iqra.ahlamontada.com

پێویستی بە ژەنینی تۆیە
تا هەڵسێتەوەو نەخنکێ
کتێبی ڕووناکی خۆی نووسیوەتەوە
کە دواتر بە خوێنی جەستەی پاکییەوە
بوو بە باخی ئەرخەوان
ئەو دەم بۆ دروستکردنی ڕووناکی سەفەری ئەکرد
ڕەنگە بۆ ئەبەد نەگەڕێتەوە
من بینیم بە لە ناو باخچەکەی میدیادا
پەیکەرەکەیان هێنایە خوارەوەو ون بوو
وەك ئەوەی ئیسۆ ئاسا خوا هەڵیکێشابێتە لای خۆیەوە
ئەگەر بینیت پێی بڵێ ئێمەش بۆلای ئەو دێین
بەڵام ئورفیوس ئەوەندە
نوقمی سەرکێشی و خەیاڵ بووبوو
وەك ئەوەی سیریسیان دەرخوارد دابێ
وەها ئەیژەنی



www.iqra.ahlamontada.com

ئەشك لە ژێیەکانی ئەهاتە خوارەوە
لە زینی ئەسپی داو ڕووبارێ
زرینگەو سەداو جوانی بۆ هەڵڕشتین
لە مەیخانەیەکی تاریکی سلێمانی
لای دارە سووتاوەکە دانیشتم
داوای گلاسێ بیرەم کردو خواردمەوە
خەیاڵ منی بردەوە سەر جێگەو بالینگانی
ئەو سارۆفیمەی
هەموو ئێوارەیەك لەسەر ڕێگای چەمی ڕێزان
لەسەر پردەکەی حافزو ناو مەیدانی شەڕی ئاوباریك
سەیری ئاسمانی دەکرد
زەینم بڕی نەئەکرد هەموو شتێ تێکچڕژا بوو
دوا قومم لە جگەرەکەم دا کە پار ئەوە وەختەبوو
زامدار بۆی داگیرساندم
دەرگای مەیخانەم کردەوە
جگە لەو ئاگرەی لەسەرمەوە هەڵئەڕژا
هیچی ترم نەبینی
دواوەم خۆڵەمێش، ڕش ڕەش ڕەش
پێشەوەم ئاگر، گەش گەش گەش



www.iqra.ahlamontada.com

## 4

هەرەسی بەفر

ئێمە هەموومان وەك ئاردی ناو پووش و پەڵاش

پەرش و بڵاو بوو بووینەوە

ئەوەندەمان گەرمایی دۆزەخی بیابان هەڵمشتبوو

ئەوەندەمان تۆزی غەریبی لێ نیشتبوو

خۆمان خۆمان نەئەناسییەوە

هەریەکەو کەوتبووینە ناو ڕێگایەك

کە هەمووی بۆ ناو دۆزەخ ئەچوو

من یەکەم کتێبی دانتیم ئەخوێندەوە

لە شیرازەیەکی نووسرابوو

بەشیرو خامە دەوڵەت پایەدارە

ئەمن خامەم هەیە شیر نادیارە

لەسۆراغی کوڕە لاوەکەی یاخسەمەرم ئەپێچایەوە

کە بوو بە چلوورە

هێشتا دوا دێی سنوورمان نەبڕی بوو

کە زریانێکی تووش هەڵیکرد



www.iqra.ahlamontada.com

لەبەردەمی خۆماندا
تەرمی سەدان ئەسپی سورخنمان ئەدی
کەسێ نەبوو گوللەی بەزەییان بەسەریانەوە بنێت
برسییەتی وەك گورگی هار
هەنجن بە هەنجنی ئەکردین،
هاوارم کرد تامیریشس
ئەی خوای ئەبەدی شیعر فریام کەوە
شەو بوو خەونم بینی
نان ببوو بە پاشای سەرزەمین
فەرش بوو بوو بە تەختی هەمایۆن و شمشێر
گەنم جەماوەری بێ شومار
بانگم کرد ئەی نان ئەی نان
ئێمە چۆن پاشای خۆمان بخۆین؟
کە بە ئاگا هاتم هاورێکانم هەندێکیان دوور
کەوتبوونەوەو هەندێکیان
چووبوونە ناو ئەبەد



www.iqra.ahlamontada.com

دەست خۆم نەبوو گریام زۆر گریام
بیرم لەو نێوەندە کیمیاییە ئەکردەوە
ئەکسیرێکم دەستکەوێ
دونیا بکات بە زێڕ تاجی ئولومپیادی
پەڕینەوەمانی لێ دابڕێژم
بەڵام ئاخ، ئۆف، ئەشك، هاوار،قیژەی ژن، زێڕەی منداڵ
هاوکێشەکەیان لێ ناهەوسەنگ کردم
کەوتمە ناو خەرەندەوە
بە ئاستەم زەینم کاری دەکردو چاوم ئەیدی
ئەو شیعرەی جزیریم هاتەوە یاد
- ژڤێ زوڵمات و دەریایێ ژمەوجان قەت خەبەر نایێ-
دەنیا کش و مات بوو
هەموو شتێ لەبەرچاوم تاری بوو
زانیم لمی زەردی مەرگی یەکجاریمە دامئەپۆشێ.



www.iqra.ahlamontada.com

5

که گیرایانەوە گریان

بەر لەوەی بەسەر پردە تەنهاکەی میرابۆ بپەڕینەوە

کە سینەی وەك بێژنگ کون کون بوو بوو

هەموو تفەنگەکانمان لوول پێچ کردو بە جێمان هێشت

کە هێشتا دوکەڵی شەڕی جەنگاوەرەکان

لە لوولەکانیان هەڵدەستا

کۆمەڵێك مراوی لەناو ڕووبارەکەدا بە هێمنی

هەموو جووجەڵەکانی خۆیان بەدوای خۆیاندابوو

بە ڕیتمی ئاوهکە هەڵئەکشان

بێئاگا لەوەی پاش کەمێکی تر زریانێکی سارد هەڵئەکا

تەواوی ئینسانەکان لەو ناوە ون ئەبن

زستانێکی تووش شەڕی لەگەڵ باخی سروشت ئەکات

تاژدین - ژ سوورەتێ شەمالێ - هاواری ئەکردو

ئەیگووت

شێر شەبال کاڕکاڕەی گوێ بەگوار

کەی ئەگەن بە باخی مەحاڵ

ئێمە لە بای تووڕە چەقیوین

خاتوون پشتوێنەکەت توند ببەستە



www.iqra.ahlamontada.com

ئەو ڕێگەیەی ئەیبڕین یەکجار دووره دوور
ڕێگایەکه لێرەوه هەڵئەکشێ تا گۆڕستانی ئەبەدی
ئەگەر بگەینه ئەو لوتکانه
بەفر ڕائەخەین و تاریکی بەخۆمان دائەدەین
ئەو کاته پێشەنگەکان لەمێژ بوو ڕایانکردبوو
دەنگی گرمه گرمی حەزیاکان
تێکەڵی بایەکی سارد ئەبوو
له ناوقەدەوه هەڵیئەپاچین
ئەگەر مردن لەو ناوه بوایه
ئەمانکڕی و خۆمان پێ دائەپۆشت
ئەگەر دارستانێ هەبوایه ئەبووین به زاباتا
زەمەنی ئەحمەد پاڵەوانیش بەسەر چوو بوو
تا بچێته شەڕی دێوەکان
ئیدی نه حەقیقەت دادی ئەداین نه خورافه



www.iqra.ahlamontada.com

ملی ڕێمان گرت و زادگامان
وەك خانوێکی دەرگا شکاو و شکستە باڵ
لەپشی سەری خۆمانەوە جێهێشت و
گیانمان خاڵی بوو لە بەها
لەدوور دوورەوە مەلی درەختەکانمان ئەبینی
بەڕەوە ئەسووتان
چیتر بریقەی کانییەکانی کێلەشین
لەوەرزی بەهاردا هەڵنەڕژان
تا لەبەر تیشکی خۆرەتاودا بریقەیان بچێتە ئاسمان
ڕەوەی ئاسکەکان ڕەوەزکانیان جێهێشت
هەموو وجوودمان بەجێهێشت و
دامانە دەست وەفای سەگەکان



www.iqra.ahlamontada.com

## 6

## ژیانەوە لە ئاگر

ئەو سەرزەمینە هەتا چاو هەتەری ئەکرد ئاگر بوو
ئاسمان و زەوی
لەسەر جەنگاوەرە بێ تیرو کەوانەکان داخرابوو
سەرچاوەی ئاوی خودا
لە باڵندەو ئاسکەکان کوێر بووبۆوە
هەر درەختەوە مەشخەڵە ئاگرێکی پێوە هەڵواسرابوو
شەوانە ئەو ناوە لە ئاهەنگی باخۆسی گریك ئەچوو
ئەتگوت بەهەزارەها دیوژین
دەستییان داوەتە فانووسی ئەفسووناوی خۆیان
بەدوای حەقیقەت ئەگەڕێن
هیچ دەنگێ لە ئۆردووگاکەی جەنگیزخان نەئەهات
تەنانەت زیڕەی ساوای لەدایکبووش قەدەغە بوو
هەر سەرێ لە لاشەی جەنگاوەرەکان
کۆشێ ئاڵتوونی خەڵات بوو
زانیم ئەو سەرانە بوونەتە ئەو ئیکسیرەی



www.iqra.ahlamontada.com

تەرم ئەکات بە زێڕ
قیامەتێ بوو لە تراژیدیاو کەڕنەفاڵێ بوو لەخوێن
ئێوارەیەکی هێندە خەمگین بوو
کە لەپشتی دالانپەڕەوە بەرەو کانی سپی شۆڕ بوومەوە
هەستم بەوە ئەکرد هەرگیز خوا ئێمەی خۆشناوێ
لە میانی زەمین و ئاسمان ئێمەی هەڵواسیبوو
لە دوورەوە ئەمبینی
کە قەتارەی کۆترە قەفەسکراوەکان ئەتروسکانەوە
ئەوانە قوربانی بوون
بۆ قوربانگای خواکانی دۆزەخی ئەگوازرانەوە
بەهەزارەها هەرقەلی دارینی جەنگی تەروادە
لە چۆمی زرێباردا
لیکاسەکانیان لە چیای ئیتادا فڕێ ئەدایە خوارەوە



www.iqra.ahlamontada.com

دوا مەڵەی مەرگیان ئەکرد
نەوەکانی هیتلەر مناڵەکانیان
وەکو کتێبی جووەکان ئەسووتاند
نوێژیان ئەکرد و لەخودا ئەپاڕانەوە
بگەن بە فیردەوسی دانتی و بە حۆرییەکان شاد ببنەوە
ئەو کاتە ئێمە لە دوا گوندەکانی سنووردا
سەیری سەرزەمینی سووتاوی خۆمانمان ئەکرد
ئەتگوت دەریایێ لە ئەبەنووسە
گۆڕستانێ لە کفنی ڕەشە
دەنگی پڕ میهری تامیریسم بیست هاواری ئەکرد
قەقنەس باڵندەیەکی چەند ئازایە
لە خۆڵەمێشی خۆی زیندوو ئەبێتەوە
هەڵەکۆك سەر لەبەفر دەر ئەهێنێ
بەهاردێ و گیا شین ئەبێتەوە
پەریخان نازداری کوردان
کە تۆمان ئەبینی ئەتگووت شاژنی دەریای
ئاوی ژیان لەبەرتا ئەڕۆیشت و یاقووتی خوێن لە
کوڵمەتا ئەدرەوشایەوە
ئەوێستاش هاتینەوە بەفری دونیا
بەسەر کەزیەکانت باریوە
هەر دێینەوە.



www.iqra.ahlamontada.com

## پەراوێزە یەکەم - قاشوانێ-

----------

- پاییز پاییز - من وەك پارێزەری فۆرمەکان بەکارم هێناوە. سترانی پاییز هێمایە بۆ شیعرە بەناوبانگەکەی گۆران.-

- دوایی نایێ دادم دادت، دێرێکی شیعری پاییزە

، ئەیوبی پەیامهێن و یوسف و یاکۆب سیمبۆلی ئەفسانەیین، ئاین زەوتی کردوون

- - سوخەن نەواز، هێمایە بۆ ئەحمەدی خانی و شیعرە بەناوبانگەکە، گەردێ هەبا مە

- خانی لەپزێڕین پاشای مەفتەنی دمدمێ، هەروەها بۆ ئەفسانەی هەڵدێرانی کچەکانی ناو دمدم لە کاتی داگیرکردن و ئابلۆقەدانی ئاشکراکردنی سەرچاوەی ئاو لە لایەن خائینەکانەوە.

. - شیرین و فەرهاد داستانی ئاشقانی کێوی بێستوون

- هێمایە بۆ ئیمارەتی بابان و شەری یەکتری و هیجرەتی نالی شوبهاندنی دوانزە سوارەی مەریوان بە نەگەڕانەوەی نالی کە داخی کوردان سەری پێ هەڵگرت. دوادێر شیعری نالییە ئەو دەم کە لە خانەقای هەولێر بووە.

- چیای سورداش هێمایە بۆ لاوکەکەی کاوێس.



www.iqra.ahlamontada.com

پەراوێزە دووەم، بەهاری دڕندان

---------

- مەبەست خانزادی میری سۆرانە.
- مەریوانی کوردستانی رۆژهەڵات و گردی سەیوانی سلێمانی.
- شیعری حاجی قادری کۆییە، وەسفێکە بۆ ئەوسای وەزعی نالەباری کورد.
- دارستانی ئەلوەتان» دارستانێکی زۆر چڕی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، بێشەی شۆرش خوێنە بووە.
- سەری هەردووشێخ نەهری دەرسیم بەدەستی تورکە رەگەزپەرستەکان پەڕێتراوە.
- بەردەرکی سەرا هێمایە بۆ خۆراگریو موقاوەمەت.
- تاجەکەی میدیا هێمای مێژوویی سەدانساڵمانە.



www.iqra.ahlamontada.com

## پەراوێزی سێهەم، پەیکەری دزراو

-----------

- - مێرێ رەمزی فیداکاری و شەهادەتە بۆ ئافرەتی کورد
- کتێبی ڕووناکی هێمایە بۆ کتێبە بەخوێن
نووسراوەکەی شەهید عبدالخالق.
گەڕایەوە - باخچەی هۆلی میدیاو نەمانی
پەیکەرەکە باخچەی ئەو هۆڵەیە کە چواندنی شەهیدە
بە ئیسا کە بۆ ئاسمان
- ئورفیوس ویستی بە موزیك ژنەکەی لە خنکان رزگار
بکات و نەیتوانی.
- ئیسۆ واتە عیسا کە خوا هەڵیکێشایەوە.
- سیریس جۆرە شەرابێکی سیحراوییە.
- سارۆفیم فریشتەی ئەفسانەکانە.
- باوکی پشکۆ شەهید عەبدولخالیق ، رەمزی
ڕووناکبیری و شەهادەت.
- - - پردی حافز لای گەلی عەلی بەگە و چەمی
رێزان لە رێگەی هەولێر و کۆیە سلێمانییە
- زامدار هێمایە بۆ مەحمود زامدار.



www.iqra.ahlamontada.com

## پەراوێزی چوارەم، هەرەسی بەفر

---------

- بەشیرو خامە دەوڵت ..... ئەمە شیعری پڕ شکایەتی حاجی قادری کۆییە.

- تامیریس بە پێی ئەفسانەی گریك خوای شیعرو ئاوازی ناسکە.

- لە کۆندا هەوڵی ئەوە دراوە کە بە جۆرە ئیکسیرێکی کیمیایی، بەرد بکەن بە زێر.

- ژڤێ زوڵمەتێ دونیایێ....... شیعری مەلای جزیرییە 470 ساڵ لەمەوبەر.

- لەکاتی ئەنفالەکاندا هێزەکان هەر دوور دەکەوتنەوەو زریان و بەفریش لەپێشدا بوو، دواوەش بوو بوو بە خۆڵەمێش.

- هەموو دێڕەکانی ئەم بەشە گوزارشتە لە سەردەمەکانی ئەنفالی بەد ناو ، تا ئێستا ئەوەی لە ئەنفال ڕوویداوە هەرگیز ناگێڕدرێتەوە، کارەساتی ئاوەها نموونەی کەمە لەسەر زەوی.

- تفەنگەکانمان لوولە پێچ کرد هێمایە بۆ فڕێدانی چەك لە کاتی نەمان و لەناوبردنی شۆڕش

- چوزانم - داستانی هیجری من شەرحی بە [illegible] ناکرێ – ئەوانەی ناو دوو داشن شیعری خالی و [illegible]



www.iqra.ahlamontada.com

## پەراوێزی پێنجەم. کە گێڕایانەوە گریاین

---------------

- لەسەر پردەکەی مبرابۆ: تەنها بەسەر نووکی ڕمەوە نەبێ ئێرە جێ ناهێڵم، خەتیبی شۆڕشی فەرەنسی بوو، لەجیاتی پردی کون کون بە تۆپ و تەیارەی دوژمن بەکار هاتووە، وەك ماسکێکی ئێستەتیکی.

- تاژدین، کارەکتەری ناو ئەویننامەی مەم و زینە،

- ئەحمەد پاڵەوان، پاڵەوانی ناو چیرۆکە کۆنەکانە.

## پەراوێزی شەشەم، ژیانەوە لە ئاگر

-------------

- دیوژین، هێمای گەڕانە بە دوای حەقیقەت کە بەڕۆژی ڕووناك چرای داگیرساندبوو.

- دالانپەڕ، سێگۆشەی سنووری کوردستان.

- هەرقەل لیکاسی لە چیای ئیتادا فڕێدایە خوارەوە چونکە وایزانی ئەوە کە ئەو جلەی بۆ هێناوە کە ژەهرڕێژکرابوو، هەرقەل بەو جلەوە خۆی لەسەر شاخێکی بەرز فڕێدایە خوارەو مرد چونکە هەرچەند هەوڵی دا نەیتوانی دایکەنێ.

- هیبارین ئەمژادەی ناو حوێنە کە خوێن لە چڕ بوون و پەیت بووندا ئەپارێزێ.

- ئەم شیعرە داستانی پڕ تراژیدیای نەتەوەکەمانە،



www.iqra.ahlamontada.com

که لەسەر ئەم زەمینەدا ، تاقانە نەتەوەی دونیایە،
کە هەمیشەو بەردەوام لە پرۆسێسی سووتاندایەو
هەمیشەش وەك قەقنەس لە خۆڵەمێشی خۆیا زیندوو
ئەبێتەوە-



www.iqra.ahlamontada.com

## خەزنەکانم

دارستانێکم هەبوو بچووك

بەقەد تەڵی هەزار چەشنی پرچی تۆ

ئێواران وەك ئاو

وەك تەقینەوەی کانی شێت

وەك ڕۆیشتنی ڕێگا سەرخۆشەکانی بەری پێت

گۆرانیم لە ناویا ئەچڕی

دڵێکم هەبوو بەقەد سێو

سێوی خەون و بەرامەو بۆ

سێوی خودایی ڕسکاوی ناو سینەی تۆ

بە یەکەوە ڕێی شارو شارانمان ئەبڕی

خونچەیەکم هەبوو بەقەد دەمی تۆ

کە ئەچووینەوە باغی تەنیایی

بۆنی هەموو گۆی زەویمان پێوە ئەکرد



www.iqra.ahlamontada.com

سنەوبەرێکم هەبوو بە قەد باڵای تۆ
پێیەوە ئەچووینە ئاسمان
لەگەڵ خودا دائەنیشتین
بەهەزاران هەزار باڵدار بەسەر سەرمانەوە ئەفڕی
تۆ هاتی دارستانت لێکردم بە تاریکی و پێوەندو کۆت
شەوگارت پڕکردم لە ترس و تەمی بێدادی
دڵت ڕەقکردم وەك ئەو دڵەی خۆت
ئێستا دوو بەردین من و تۆ
بەردێ لەناو سینەی منە
بەردێکیش لەناوسینەی تۆ



www.iqra.ahlamontada.com

## تیشكی ناو ئاو

1

زۆرجار چوومەتە چیاكان

ئاوم لەسەر تاوێرەبەرد خواردۆتەوە

بیرم لەوە كردۆتەوە هەرچییەك من دائیەڕێژم

بە نێو سەختەندازی ژیان

ئاگا بەبەرزی ئەو لوتكەی

سروشت بڕستی پێداوە

هەربۆیەش بڕیارم داوە

بەرزی بكەم بەنیشتیمان

2

زۆرجار بەسەر بەنداوەكاندا وەستاوم

بیرم لەوە كردۆتەوە چی بنووسم

ئاگا بە جوانی ئەو تیشكەی

هەتاو ئەیڕێژێتە ناو ئاو

هەربۆیەش بڕیارم داوە

هەر گەوهەرێ دایبڕێژم

ئەبێ گەش بێ وەك تیشكی ناو دڵی هەتاو



www.iqra.ahlamontada.com

3

چوومەتە ناو کۆڕی مەستان

پێکی خەستم خواردۆتەوە

بیرم لەوە کردۆتەوە چی بنووسم

ناگاتە مەستی کاسەیێ شەرابی سوور

هەربۆیەش بڕیارم داوە

بەشەرابی جاویدانی

زەیتی شیعر داگیرسێنم

4

زۆرجار بوومەتە میوانی ناو دەریاکان

مەلەم لەگەڵ پەری خەیاڵم کردووە

بیرم لەوە کردۆتەوە

چی بنووسم بە دڵ و داو

ناگا بە شەوقی ئاوەکان

هەربۆیەش بڕیارم داوە

شیعر پڕکەم لە خووڕەی ئاو



www.iqra.ahlamontada.com

5

چوومەتە ناو دڵی سپی مانگەشەوان

بیرم لەوە کردۆتەوە چی بنووسم

ناگا بە زیوی ئەو بەفرەی

تریفە ئەیبەخشێ بە تاشەی چیا

هەربۆیەش بڕیارم داوە

جەوهەری شیعرم تریفە بێ

کەروێشکە بکا وەك گیا



www.iqra.ahlamontada.com

## سەراب

هێندەم ئەوین لە نێو دڵم داکردووە
بەشی هەموو عاشقانی دونیا ئەکا
هێندەم ئاوی جاویدانی
بەسەر شەتڵی ژین ڕشتووە
بەشی هەموو تینووانی زەمین ئەکا
هێندەم گریان لە ناو سینە هەڵگرتووە
بەشی هەموو پرسەکانی مێژوو ئەکا
کێ ئەوەندەی شیعرەکانی من خەمبارە
بەدیار جەستەی نیشتیمانێ
سەدان ساڵە بۆ ئازادی
خاك و خۆڵی تێکەڵ بە خوێنی خۆی ئەکا؟



www.iqra.ahlamontada.com

## کەی دێی

کەی دێی هەتا مەلت بنێرمە پێشوازی
داو داو تیشکت بۆ ڕابخەم
پونگی چیات بۆ بهۆنمەوە
مرواری ژێر دەریاکانت بۆ ڕاوبکەم ؟
کەنار کەنار
گەنمی سپی قەندەهارت بۆ ئەچێنم
زێ زێ ئاوت بۆ لەبەردی شاخ ئەهێنم
ڕێگات بۆ کورت ئەکەمەوە
تۆ ڕووبارو ڕووبار وەرە
هەر زوو ئەگەیتەماڵی من
بەس تۆ وەرە
سامالّت بۆ ئەهێنمە خواری خوارەوە
لە ناو ئاونگی سپێدان غەرقت دەکەم
سووری زەمەن ئەوەستێنم
تەختی ترست بۆ لەق ئەکەم
شەوگارت بۆ
بەشەوقی شیعر شەق ئەکەم
بەس تۆ وەرە



www.iqra.ahlamontada.com

## شەڕ بۆ ژیان

شەڕێکی زۆرم لە گەڵ ژیان کرد

بەڵام ژیان بێ ڕەحمانە

لە ناو دڕك و داڵی مەینەت بە جێی هێشتم

شەڕێکی زۆرم لە گەڵ خودا کرد

بەڵام خودا وەك ئەوەی من دەستکردی ئەو نەبم

لە میانی ئاسمان و زەوی بە جێی هێشتم

شەڕێکی زۆرم لە گەڵ قەدەر کرد

بەڵام قەدەر زۆر نامەرد بوو

وەك ئەوەی من نێچیرێك بم

لە ژێر چڕنووکی ئەزەلی داگیر کەران بەجێی هێشتم

شەڕێکی زۆرم لە گەڵ خۆم کرد

بەڵام خۆمیش لە هەموویان سەگبابتر بوو

لە ناو جەرگەی خوێنی یەکتر بە جێی هێشتم

شەڕێ نەماوە من نەیکەم

هەتا دواجار شەڕیش خەنجەری ئەبەدی



www.iqra.ahlamontada.com

کوتایە ناو قەدو پشتم
لە پێناو تۆ بۆ ئەبەد من شەڕی خۆم ئەکەم
کێ ماوە دەستی هەڵبڕێ
من هێشتا کورد بوونم ماوە
تا هەتایە بچێتە ناو شەوەزەنگی هەموو شەڕێ



www.iqra.ahlamontada.com

## زۆری ماوە

هێشتا لوتکەی گەلێ مانای بەرز ماوە
شیعر پەی پێ نەبردووە
هێشتا ڕێگەی زۆر تاریك و نووتەك ماوە
هەنگاو ڕێی پێ نەبردووە
دێوی زۆر کوشندە ماوە
ڕێگەی ئاوی لە عاشقاندا گرتووە
زۆر باغ ماوە گوڵی ئازادی لێ بچنین
زۆر بێستانی شیعر ماوە
تا جاویدانی تیا بڕنین



www.iqra.ahlamontada.com

## دوور دوور

دوور ڕۆیشتی دوور دوور
تا ئەو پەڕی ئاوە دوورەکان
ئەزانم تا تۆ دێیتەوە
سەرم پڕ ئەبێ له بەفرو
خوێنم پڕ له شەکر ئەبێ
یا ماڵم ئەبەمە ناو خۆڵ
تێکەڵ ئەبمەوە وەك جاران
یا ئەبم بە پارچە تەمێ
سپی ئەچمەوە لە ئاسمان



www.iqra.ahlamontada.com

## قاسەی خۆر

کە دێی ئەڵێی بات لە نێو لەپت شاردۆتەوە
تاکە درەختێ ناجووڵێ
ورشەی هیچ گەڵایێ نایێ
ئەڵێی شەووت لە ناو چاوت بەند کردووە
بۆیە هەرگیز خۆر هەڵنایێ
یا هەر ئەڵێی قاسەی خۆرت شکاندەووە
کەونت لە نوور ڕەخساندووە
تۆ هەمیشە وەرە نامووسی کەون بگۆڕە
خۆر لە ئاسمان دابەزێنە
تەخت و بەختی دوو جەمسەری وەرگەڕێنە
لەوەتەی خۆت لە نێو سێودا شاردۆتەوە
دونیا هەمووی تام سێو بووە



www.iqra.ahlamontada.com

**بەرانبەر جوانی**

کە ئەدوێی وشەکانت ئەبن بە قەند

لە دەمی چیا ئەتوێنەوە

جۆگەلەکان پڕ لە شەهدی هەنگوین ئەبن

پیتەکان ئەبن بە مرواری

لەناو دڵی تاریکی شەو ئەشنێنەوە

کە جوانیت تاوێر هەڵوەرێنێ

دەبێ حاڵی دڵم چی بێ

تۆ هەمیشە بدوێ



www.iqra.ahlamontada.com

## رامبۆ

من کار لەناو ئایرۆنیەتی وشە ناکەم
کار لەناو ئایفۆنیەتی شیعر ئەکەم
ئۆبێکت پێلاوی واقیعە
ئەوەی بۆ شیعر گەورەیە سۆبێکتی ڕیتم و سەدایە
رامبۆ دوای ئەوەی گوڵەکانی لە ژێر پێی خۆی
پلیشاندەوە
وتی ئێوە سۆبێکتی من نین
دوای بڕینی قاچی چەپی
قاچە بڕاوەکەی خۆی نایە ژێر هەنگلی و
بە گریان و پاڕانەوە گەڕایەوە لای گوڵەکان
داوای لەوان کرد ببیبوورن
بەڵام گۆڵێ، تاقە گوڵێ نەبوو وەڵامی باتەوە
رامبۆ گریا زۆر زۆر
مرد، نە گوڵێ نە گیایێ
لە سەر گۆڕەکەی شین نەبوو
کێن ئەوانەی پێیان وایە
تەنها ئۆبێکت جگەرەی ڕۆژانەی دونیایە
ئەدی بۆچی وەها ڕاڕاو وەها دڵتەنگ
دەنگیان لە هیچ شیعرێ نایە؟



www.iqra.ahlamontada.com

## ناسرەوێ

نەکەوتووم زەمەن
باری گرانە و لە کەوتن تێ ناگا
ئەگینا من تا ئێستاس وەك خۆمم
بەڵام دەستی عیشق و ئەوینە بە زەمەن ڕاناگا
ئەوانەی ئەگۆڕێن
پێستیان ڕەونەقی تیشکی خۆر ناناسێ
هەر بۆیەش بە هەموو گەرمیەك ئەتاسێ
بەرگەی گەرمی و ساردی ناگرن
هەندێ جار لە ساتێ چەند جارێ ئەمرن
ئێستاکەش وەك خۆمم
نوقمی زۆر لە ئاوی لێلاوی
زۆر رووبارو چۆمم



www.iqra.ahlamontada.com

## قەڵەمی ئەوین

1

بە قەڵەمی خەمگینی پاییز

لە سەر گەڵا نووسیم تۆم خۆشئەویست

هێندە لە باڵای تۆ ئاڵام تا دواجار

لە باوەشی من هەڵوەرایت

2

بە قەڵەمی تەڕی باران

لە سەر سینەی کێڵگە نووسیم تۆم خۆشئەویست

هێندە بە گوڕ باریمە سەر دڵی گەرمت

تا دوا تنۆکت هەڵمژیم

3

بە قەڵەمی هاژەی ڕووبار

لەسەر ڕوخساری دەریا نووسیم تۆم خۆشئەویست

هێندە بە تاو هەڵڕژامە دەروونتەوە

تا ونبووم و بڕامەوە



www.iqra.ahlamontada.com

4

به قەڵەمی گەرمی هەتاو

لەسەر ڕۆحی بەفر نووسیم تۆم خۆشئەویست

هێندە بە کوڵ بە ناو خوێنی تۆ هەڵپژام

تا بۆ ئەبەد توایتەوە

5

بە قەڵەمی ناسکی پەپوولە

لەسەر گڕی مۆمێ نووسیم تۆم خۆشئەوێت

هێندە هاتمە ناو چاوتەوە هەڵکروزام

تا دواجار توامەوە



www.iqra.ahlamontada.com

## زەوی تەنها زەوی

له دامێنی پڕ له گەوهەری گیادا
که باشووکه خەمبارەکان تیایا
هەلهەلەی تەنهایی ئەچڕن
بەسەر ئەو دارکاژانەی به شنەی بایه دوورەکان
پەرچەمی ماتەمینی
به سەر گوڕغەریبەکانەوه ئەبەشنەوه
له ئاسۆیەکی خەمگیندا که تیشکی ئەرخەوانی
ئەدرەوشێتەوەو دونیا شەلاڵی خوێن ئەبێ
نەسیم وەك هەڵسانی لەهێ و سەمای داربیی ناو ئاو
دەپرژێنه ناو دارستانی ڕۆح
لەو کاتانەدا نەمری
ئاوات خواستەی هەموو بوونەوەرەکانی سروشته
خودا له بانی بەرزەوه
سەیری بێ ئارامی مرۆڤ ئەکات



www.iqra.ahlamontada.com

وەك ئاشەوانێ جەستەی مردووەکان
دەکا بە زادی ڕۆژانەی مەلەکان
نەوەی تازەی لێ ئەڕسکێنێ
کە گلێنەی چاوە ڕەشەکانی دوای جەنگەکان
وەك ئەڵماسی ڕەش
لە لێواری دەریاکاندا ئەشەوقێنەوە
وای لەو کاتەدا دونیا چەند بە ئازار ئەڕۆشێنێتەوە
لە هەمان ئەو ساتە سیحر ئامێزەدا
کە زمان جیهانبینی خەونە
سەر ئەبێتە خەزنەی خەیاڵ و
دڵ پڕ ئەبێ لە کریستاڵی تاسە
کپی و بێدەنگی سەراپای وجوود دائەگرێ
بناری شەلاڵ بە جریوەی ئارامبەخشی مەجاز
کەون بەهەموو مەجەڕڕاتەکانی باڵئەگرێ
ئەوەیان چ خەون و خەیاڵێکە



www.iqra.ahlamontada.com

مرۆڤ ئەخاتە زیندانی ئەندێشەوە؟
درەختە سەر لەبەر هەورەکان
کە ئەڵێی قاڵی ڕەنگاورەنگی خودان
ئاسمان دەشارنەوە
فەرهەنگی زمانی دامێن
پڕ لە وشەی جاویدانی ئە بێت
هەموو گیانلەبەرێ ئەکەوێتە سەما
هەتا دێ ئاوی تەقیوی ناو تاوێرە بەردەکان
ئاوێزانی خاك ئەبێ
ئەوکاتە دیدگا لە چاو و تامی ژیان لە دەم و
مەمکی سروشت لەدەست
چەند خۆش ئەبن خودایە
تەمتوومانێکی سپی
ئاواز لە ئاسمان دەسەنێ و ئەیچرپێنێتە گوێی مرۆڤ
ئاوازێ کە نەمری ئەبەخشێ بە شیعر و
کۆتایی بە لێکدانەوەی بێ مانا
هەموو شتێ لەبەرامبەر جوانیدا
وەك بەفر ئەتوێتەوە



www.iqra.ahlamontada.com

تەنها جوانییە سەرداری ژیان

غوربەتێ ئینسان دائەگرێ

لە غوربەتی زەوی ئەچێ

کە ئاوی ژیان ناگاتە دەروونی پڕ لە شەقاری

تا جلی بەهار لەبەر بکات

هەموو شادییەکانی سەر زەوی

سەرەتای کۆچی باڵندەکانە

سەرەتای شەقاوەتی مرۆڤەکانە

ئەو مرۆڤانەی لەگەردی بەیانەوە تا بولێل

بەدوای ساتێ حەسانەوە ڕائەکەن و هەر ڕائەکەن

بەڵام هەرگیز ناگەن

ئەوە خەمە قووڵەکانە بە بای ئەکەن

هەیداد هەی بێداد مانگەشەو چۆن

بەیەك گەیشتنی ئەو هەموو ئەویندارانەی ئاشکرا کرد

کەوتنە بەرتیری ڕاوچییەکانی تاریکی

لە دوورەوە کێلی گۆڕستانەکان سپی ئەچنەوە

وە ك ئەوەی باوەش بۆ

ئەو هەموو خۆشییە بکەنەوە



www.iqra.ahlamontada.com

هەموو خۆشیەكانیش
سەرەتای كرانەوەی گۆڕستانەكانە
لەو دامێنە پڕ لە شەوی یەڵداو كورتەساتی خۆشییەكان
ئەبێ ئینسان چی بكات؟
باشووكەكان لەدەمی ئەشكەوتی بنارەكان كۆچیان كرد
گۆڕستانەكان چۆل بوون و ئینسان بە تەنها مایەوە
منیش لە ئاستانەی ئەو ماجەرایەی
ئاوێزانی خۆشی و بەدبەختییە
سەیری بنی ئاسۆ ئەكەم
دڵم پڕ بووە لە ڕۆشنایی
كە ئەزانم هەموو رۆشناییەكان سەرەتای تاریكین
بۆیە تەنها دانیشتم
كەسێ نەبوو دڵم لە قووڵایی جەستەم ڕزگار بكات
كێ هەیە دڵم بداتەوە
لە میانی عەدەم و هەبوونی بێ مانا
چ جیاوازییەك هەیە ئەی دۆست ؟
كە ژیان شیرین ئەبێت
تاڵی بۆ وا بە پەلەیە بگات



www.iqra.ahlamontada.com

که دڵ پڕ دەبێت لە سرووودی شادی
پرسە بۆ وا زوو هەڵئەکات
هەموو گەرمییەکان
سەرەتای دەرکەوتنی سەهۆڵبەندانە
تەنها زەویی هەیە تیایا بژین سارایەو کۆتایی نییە
جگە لەسەر پشتی تۆ ئەی زەوی
ئەی دایکی مرۆڤایەتی
ژیان لە هیچ شوێنێکی تر نییە
ناشبێ



www.iqra.ahlamontada.com

**قوربانی**

دەرگام لە ڕەشەبا گرت

تا تۆ نەوەریت

بەڵام ئەفسووس خۆم وەریم



www.iqra.ahlamontada.com

## بەرەو سپی

شەونم و سپێدەم تێکەڵ کرد خۆرهەڵات
تاریکی و ئاسمانم تێکەڵ کرد مانگ هەڵات
هەویری مرۆڤ و شەبەقی ئارەزووم تێکەڵ کرد
دونیا پڕ دوکەڵ و ئاگر بوو
کە پاکی و دەروونم تێکەڵ کرد
سەرتاپای ئەم کەونە
سپی سپی هەڵگەڕا



www.iqra.ahlamontada.com

## کلیلی گەوهەر

ئەو کلیلەی دابووم بە تۆ
ئەوە کلیلی ڕۆحم بوو
کەبە گۆشت و خوێنی جەستە دامڕشتبوو
ئەشکی ڕوونی چاوەکانمی هەڵمژتبوو
شەڵاڵی بۆن و بەرامەی نیشتیمانی خۆم کردبوو
بەسینەی خۆتی هەڵواسە
ئەو کلیلە کتێب و دەفتەری من بوو
ئەو کلیلە شەوقی پڕ جەوهەری من بوو



www.iqra.ahlamontada.com

## سازش

من ئەمەوێ سازش لەگەڵ زمان بکەم
ماناو ڕیتمی قووڵاییەکانم پێ بەخشێ
بەڵام هەتا دێ گوزارشت
بۆ ئەستەم و سەختەندازەکان هەڵئەکشێ
من ئەمەوێ زمان بکەم بە بلێسە
درەوشانەوەی ئەبەدیم بۆ هەڵڕێژێ
بەڵام قەڵەم وەکو کچێ
بۆ ئەمیری زمان ڕائەکشێ
زمان بۆتە زیندانی بوون
تا دێ سەخت هەڵئەگەڕێ
سینەم پڕ بووە لە مەلی تینووی فڕین
زمان ئاسمانی گرتووە
دەرگای لەسەر ئاخاوتنی
جیلوەی جوانی داخستووە



www.iqra.ahlamontada.com

## من ئانجیلۆم

ئەزانم لەناو دڵی هەر بەردێ
پەرییێ زنجیر کراوە
لەناو دڵی هەر کەڤرێکا
داودێ خۆی حەشارداوە
ئەبینی ژیان چەن بە پەلە
جوانییەکان ڕائەماشێ
هەربۆیەشە ستیلەکەم
جەستەی بەردەکان ئەتاشێ



www.iqra.ahlamontada.com

## ئەسپەکە ئەسپەکە

له دوور دوورەوە ئەسپێک دێ
ئاگر له سمی هەڵئەچێ
ئەو ئەسپە نیشتیمانی ون کردووە
هەرگیزاو هەرگیز ناگاتە جێ
چاوەکانی پڕن له حەسرەت
شەڵاڵی ئارەقەی کەوتن
لەهەموو ئەسپێ ماندوو ترە
له هەموو ڕێبوارێ تێنووترە
کورژنی ئەو ئەسپە له هەموو هاوارێ بەسۆ ترە
ئەسپێکە دەشت و کێوو تەلانی ڕکی تەی کردووە
ڕێگەی هات و نەهاتی بڕیوە
گەیشتۆتە هەر ئاوێ وشکی کردووە
له هەر مەیدانێکی جەنگا هەزاران ڕمی پێکەوتووە
زاکیرەی پڕە له شکست و برین
ئەو ئەسپە ئێمەین
کە نە ئەگەین و نە ئەمرین



www.iqra.ahlamontada.com

## شکاوه دڵی من

کووپەڵەی دڵی من شکاوه
شکاوه کووپەڵەی دڵی من
پڕیەتی لە گەمەی دڵشکان
پڕیەتی لە یەقینی گەرمی پڕ گومان
کووپەڵەی دڵی من پڕیەتی لە شەرابی ئەوین
پڕیەتی لە شەرابی ئەوین دڵی من
پڕیەتی لەخەونی ئەبەدی هەڵفڕین
پڕیەتی لە پرسەی بێ گۆرانی چڕین
شکاوه دڵی من
دڵی من شکاوه
ئێستاکە گۆشت نییە
دڵی من هەر ئاوه



www.iqra.ahlamontada.com

## پێرست





www.iqra.ahlamontada.com

یەکێ لە گرفتە دێرینەکانی ئەشقی شاعیر، ئەوەیە هەرگیز دەستی لە شیعرەکانی خۆی بەرنابێ، بۆیە هەمیشەو بەردەوام شیعرەکانی بۆ ئەو، وەکو کێلگەیەکی لێدێ، بە درێژایی ئەزمونی خۆی کاری تیا بکات و پاکی کاتەوە، دوکەڵی ناو فەزاکانی بڕەوێنێتەوە، بۆیە منیش هەر لەیەکەم چاپی خاک و هەڵۆ وە تا وەکو ئێستەیشی لەگەڵدا بێ، هەمیشە وەکو کەسێ گەوهەرێکی لەبن دارو پەردوی ئەم کێلگەیەدا ون کردبێ، بەناویا دەسووڕێمەو کاری لەسەر دەکەم. ئەو چەند بەرگەی لە بەردەستانایە، ژیان و ئەزمونی شیعری منە، گریان و پێکەنینی منە، هەڵوێست و ئەوینیمنە، بۆ هەموو ئەوانەی کە لەمەودوا دەیانەوێ ئیش لەمەڕ شیعرەکانی من بکەن، پێم باشە کە ئەم چەند بەرگە بکەن بە سەرچاوەی ڕاستەقینەی بەرهەمە شیعریەکانم، پشت بەو چەند بەرگە ببەستن، کە من لە ئێستادا بە سەرەتاو دواهەمین قۆناغی دیدگاو شیعرییەتی خۆمیان دەزانم.

www.iqra.ahlamontada.com